# ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون

نووسینی
عەلی باپیر

## پێشکەش بێ :

بەومسوڵمانانەی کەبەباوەڕێکی بەتینو عەزمێکی پۆلاییینو دلێکی پڕ لەئەوینەوە ، تێدەکۆشنو ڕەنجدەدەنو شەوو ڕۆژان پێکەوە گرێ دەدەن ، بۆئەوەی تێبگەنو پێبگەنو بەرەو خوا بچنو کاملّ بن ، تاسەرەنجام ڕێیان بکەوێ بەدیداری بەرزیی شادبوون .

## پێشەکیی چاپی دووەم :

الحمد لله كما ينبغي لجلال وجهه وعظيم سلطانه، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على محمد النبي الأمي الأمين وآله الطيبين وصحبه الأكرمين، والتابعين لهم بإحسان الواصلين منهم والسائرين.

مسوڵمانانی بەڕێزو خۆشەویست . . .

ئەم کتێبەی بەردەستت کەبۆیەکەمجار لەساڵی ( ١٤١٠ ) ی کۆچی نووسراو چاپکرا هەوڵێکی بەندەبوو بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنو بۆشایی‌یە زلەی کەلەلایەنی مەعنەوی‌یەوە لەکاری ئیسلامیدا هەستی پێدەکرد . جائێستاش

- واتە پێنج ساڵ دوای ئەو کاتە- هەرچەندە کاروحاڵەتی ئیسلامی لەکوردستانو شوێنەکانی تری جیهانی ئیسلامیشدا، بەشێوەیەکی گشتی لەچاو ئەوسا زۆر گەشەی کردووەو بەرەو پێش چووە، بەڵام بەڕای بەندە لەڕووی مەعنەوی‌و ئەخلاقی‌یەوە ئەو کەلێنو بۆشایی‌یە هەر هەستی پێدەکرێ، بگرە لەگەڵ گەورەبوونی قەوارەو کیانی کاروحاڵەتی ئیسلامیدا ئەویش زلتر بووە !

بۆیە لەسەر داواکردنی چەند برایەکی خەمخۆرو دڵسۆزیش بەپێویستمان زانی کەلەم قۆناغەدا بەشێوەیەکی فراوانترو چاکتر لەجاری پێشوو ( ڕێگای صاڵحبوونو بەرەو خوا چوون ) چاپو بڵاوبکرێتەوە، پاش دەستکاری‌یەکی کەم لەهەندێ شوێنیدا .

ئەوەی کەبەپێویستیشی دەزانم لەپێشەکیی چاپی دووەمدا لەبواری مەسەلەی ( تەزکیە ) وپەروەردەی مەعنەوی‌یەوە ئاراستەی خوێنەرانی بەڕێزی بکەم لەم چەند خاڵەدا بەکورتی دەیخەمە ڕوو :

١- بەندە ڕۆژ بۆ ڕۆژێ هەتا زیاتر بەئەزموونەکەل ( تجارب ) ی کارو چالاکی ئیسلامی‌دا ڕەت دەبمو لەو مەیدانە موبارەکەدا ئەسپ تاودەدەم، زیاترو زیاتر لەو قەناعەتەمدا دڵنیا دەبم، کەئەو لایەنە گرنگو مەزنەی ( تەزکیە ) بەردی بناغەو بڕبڕەی پشتی دینداری‌و مسوڵمانەتی‌و، کاکڵو جەوهەری بەندایەتی‌و خواپەرستی‌یەو هەرکەسێك لەو لایەنەیدا لاوازو کرچوکاڵ بێ، حەتمەن لەلایەکانی تریشی- یان زۆربەیاندا بێهێزو ناتەواو دەبێ، هەربۆیەش خوای کاربەجێ‌وزانا لەپەروەردەکردنو پێگەیاندنی کۆمەڵی ئیسلامی‌یەکەمدا لەسەردەستی پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ هێندە جەختو داکۆکی لەسەر لایەنی مەعنەوی‌و ئەخلاقی کردووەو زۆرترین

ڕووبەری سووڕەتە مەككی‌یەكانی بۆ تەرخان كردووە چ بەشێوەی ڕاستەوخۆ چ ناڕاستەوخۆ ، بۆ وێنە سەرنجی ئەم چەند ئایەتەی سووڕەتی ( الذاريات ) بدە : ﴿ إنَّ المتَّقينَ في جَنّاتٍ وعُيونٍ . آخذينَ ماآتاهُم رَبُّهم إنَّهُم كانوُا قبلَ ذلِك مُحسنينَ . كانوُا قليلا مِنَ الليل مايَهجَعونَ . وَبالأسحارِ هُم يَستَغفِرونَ . وَفي أموالِهِم حَقٌ لِلسّائِلِ والمَحروُم . وَفي الأرضِ آياتٌ لِلموُقنين . وَفي أنفسِكُم أفَلا تُبصِرونَ . . . ﴾ ( ١٥-٢١ ) .

٢- شتێكی ئاشكرایە كەئینسانی مسوڵمانو ئینسانی نامسوڵمان چەند جیاوازی‌یەكی گرنگو بنەڕەتی‌یان لەنێواندا هەیە ، كەسەرەكی‌ترینیان ئەوەیە ئینسانی مسوڵمان خاوەنی لایەنی مەعنەویو ئەخلاقی‌یە ، بەڵام بابای نامسوڵمان لەو بارەوە پووچو بۆشە . جادیارە هەتا ئینسانی مسوڵمان ئەو لایەنەی تێدا بەهێزتربێو زیاتر تێیدا گەشە بكات زیاترو چاكتر لەخەڵكی بێ‌دینو نامسوڵمان جیادەبێتەوەو ، هەتا لایەنی ناوبراویشی تێدا لاوازترو بێ‌هێزتر بێت بەپێچەوانەوە دەبێ ، هەربۆیەش دەبینین لەكاتێكدا خوای پەروەردگار ویستبێتی وەسفو پێناسەی كۆمەڵی مسوڵمانان بكات ئەو لایەنە ڕووحی‌یە ڕووبەرێكی زۆری بۆ تەرخان كراوە ، بۆوێنە : لەسەرەتای سووڕەتی ( المؤمنون ) دا كەتەرخان كراوە بۆ پێناسەی بڕواداران ، خوای زانا فەرموویەتی : ﴿ قَد أفلَحَ المؤمنون . الَّذينَ هُم في صَلاتِهِم خاشِعونَ . وَالَّذين هُم عَنِ اللَّغوِ مُعرِضوُنَ . وَالَّذينَ هُم لِلزكاةِ فاعِلونَ . . . ﴾ هەروەها لەكۆتایی سووڕەتی ( الفرقان ) دا كەدیسان بۆ وەسفو ناساندنی بەندە چاكو هەڵبژاردەكانی خوا دیاری كراوە ، فەرموویەتی : ﴿ . . . وَعِبادُ الرَّحمن الَّذينَ يَمشونَ على الأرض هونًا وَإذا خاطَبَهُمُ الجاهِلونَ قالوُا سَلامًا . الَّذينَ يَبيتُونَ لِرَبِّهِم سُجَّدًا وَقيامًا . وَالَّذينَ يَقولوُنَ رَبَّنااصرف عنّا عَذابَ جَهَنَّمَ إنَّ عَذابَها كانَ غَرامًا . . . ﴾

كەواتە بائەو لایەنە لەخۆماندا تۆختروقوڵترو بەهێزتر بكەین، كەدەبێتە مایەی نزیكتربوونەوەمان لەخواو دۆستەكانیو دوورتركەوتنەوەمان لەشەیتانو شوێنكەوتووانی .

٣- بێگومان تەزكیەی نەفس خاڵێكی هاوبەشی هەموو مسوڵمانانەو تاقەهۆی ڕزگاریو سەرفرازی‌یانە وەك خوای مەزن فەرموویەتی : ﴿ قَد أفلَحَ مَن زَكّاها . وَقَد خابَ مَن دَسّاها ﴾ الشمس ( ١٠ ) ، هەروەها فەرموویەتی : ﴿ قَد أفلَحَ مَن تَزَكّى ﴾ الأعلى ( ١٤ ) ، بەڵام تەزكیەی نەفسو بەهێزی‌ی لایەنی مەعنەوی بۆ كەسانێك كەسەرگەرمی كاروخەباتی ئیسلامینو لەگەڵ كۆمەڵگەدا تێكەڵیو هەڵسو كەوتیان زیاترە ، لەهەموو كەس پێویستترو چارەنووس‌سازترە ، چونكە بابای‌وا هەمیشەو دایم دەكەوێتە بەر فشارو تەئسیری كۆمەڵگاو دەوروبەرو ئەگەر لەو ڕووەوە زۆر قایمو دامەزراو نەبێ لەخشتە دەچێو

هەڵدەخلیسكێ، جابۆیە ئینسانیوا هەم بۆ پاریزرانی لەهەڵەو لادانو خلیسكانو هەم بۆ كاربۆئاسانبوونو بەرچاوڕوونی زیاتری زۆر زۆر پێویستی بەتەزكیەی نەفسی هەیە، خوای زاناو میهرەبانیش بەپێغەمبەرمانی فەرمووە: ﴿ يَاءَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا نِصْفَهُ أَوِ انْقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلًا إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْئًا وَأَقْوَمُ قِيلًا. إِنَّ لَكَ فِي النَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا. ﴾ المزمل ( ١ـ ٧ ).

٤ـ ڕەواندنەوەی چەند ئیشكالێك:

ئەوانەی كەوەك داركەری شەوێ ( حاطب الليل ) چاكو خراپی ( تصوف ) ڕەفزدەكەنو لەجیاتی بەبێژینگی قورئانو سوننەت لەبێژینگی بدەنو چاكی قبوڵو خراپی فرێبدەن، بێ سێو دوو زەڕب لەهەمووی دەدەن. بەحیسابی خۆیان بەم بەڵگانە خۆیان ئیقناع دەكەن:

( أ ) هەبوونی بیدعەو شتی ئەفسانەیی لەبەرهەمو كەلەپووری ( تصوف ) دا.

( ب ) هەبوونی بەناو فەرموودە ( حديث ) ی هەڵبەستراو ( موضوع ) لەكتێبو سەرچاوەكانی ( تصوف ) دا.

( ج ) سوود لێبینرانو ( استغلال ) كردنی هەندێك لەسەرانی ئەهلی طەریقەت بۆ لێدانی ئیسلامی ڕەسەن لەلایەن ناحەزانی دینەوە لەڕابردوو وئێستاشدا.

( د ) وشەی ( تصوف ) وشەیەكی داهێنراوو بێگانەیە.

ئێمە ئاوا وەڵامی ئەو ئیشكالانە دەدەینەوە زۆر بەكورتی:

یەكەم: ئێمەش ئەوە دەسەلمێنین كەگەلێك كتێبو سەرچاوەی ( تصوف ) و بیرو هۆشی زۆربەی هەرە زۆری ئەهلی طەریقەتیش پڕپڕن لەشتی بیدعەتو ئەفسانەییو ناشەرعیو بیرو بۆچوونو فەلسەفەی یۆنانیو هیندیو بووذایی بەگشتیو ئایینی شێوێنراوی مەسیحی بەتایبەتو چ لەبواری عەقیدەوە چ عیبادەتو چ ئەخلاقو ئادابو. هتددا دا، بەڵام؛ هەروەك چۆن ئەو جۆرە كتێبو سەرچاوانە هەن، كتێبو سەرچاوەی تریش هەن كەزۆر پاكو پوختەنو جێی متمانەو باوەڕن، وەتێكەڵبوونی ئەو جۆرە شتانە بەبەرهەمو كەلەپووری زانایان نابێ وامان لێبكا كەلەخێرو چاكەكانیان بێبەش بین. چونكە ئەوە هەر كتێبو سەرچاوەكانی ( تصوف ) نین كەتووشی ئەو دەردە بوو ون، بەڵكو هەركەسێك شارەزایی هەبێ دەزانێ كەكتێبەكانی ( تفسير ) و ( فقه ) و ( عقيدة ) و ( تأريخ ) یش بەو دەردە چووونو ئەگەر لەبەر هەبوونی هەڵەو كەموكوری وازیان لێبهێنین زیانێكی یەكجار زلمان لێدەكەوێ كەهیچ كەسێك بۆمان قەرەبوو ناكاتەوە.

دووەم: ڕاستە کتێبو سەرچاوەکانی ( تصوف ) هەندێکیان خاڵی نین لە بەناوفەرموودەی دانراوو لاواز، بەڵام زانایانی فەرموودەناسی ( محدث ) فەرموودەو بەناوفەرموودەیان لێك هەڵاواردوون، بۆ وێنە ( عراقی ) حەدیسەکانی ( إحياء علوم الدين ) ی غەزالی ی زۆرباش ( تخريج ) کردووە، دیارە هیچ کەسێکیش بۆ ( أحاديث ) لەکتێبەکانی ( تصوف ) یان ( فقه ) دا ناگەڕێ چونکە دەزانێ کتێبو سەرچاوەکانی ( سنة ) شوێنی پەیداکردنی ( حديث ) ن!

سێیەم: مەسەلەی ( استغلال ) کرانی هەندێك لەبەسەرانی ( تصوف ) لەلایەن ناحەزو دوژمنانی ئیسلامەوەش شتێکی نکۆڵی لێنەکراوە، بەڵام وەك لەخاڵی پێنجەمدا باسی دەکەین، پێویستە ئێمە ( تصوفو تزكية ) وەك لایەنێکی گرنگو ڕەسەن لەئیسلام لەگەڵ ڕێبازەکانی تەصەووف ( طرق التصوف ) تێکەڵ نەکەین، دیسان ئاگاداریش بین کەئەگەر هەندێك لەبەناو سەرانی ( تصوف ) هەڵوێستی ناڕەسەنو بێشەرعیان هەبووەو هەیەو گوڵلەمستی ناحەزانی دین بوون، کەڵەپیاوی زۆریشیان تێدابوونو ئێستاش کەمێك هەن کەنموونەی مەردایەتیو پەڕێزپاکیو خەباتو فیداکاری بوونو هەندێك جار ڕابەرو سەرکردەی گەلێك شۆڕشو ڕاپەڕینی ئیسلامیش بوون! ئنجابێگومان ( استغلال ) کرانیش تەنهالەسەر ڕدێنسپیو سەرانی ( تصوف ) تاپۆ نەکراوەو خەڵکیتریش هەبووەو هەیە.

چوارەم: مەسەلەی ناویش، شتێك نییە بۆ ئەوە بشێ بکرێتە بەڵگەو بیانووی ڕەفزکردنی ( تصوف ) چونکە:

ئێمە بەرگری لە ( مسمى ) ی ( تصوف ) دەکەین کەئەو هەموو کتێبو سەرچاوە زۆرو زەوەندانەن کەزاناو پێشەوایانی پایە بەرزمان لەکۆنو هاوچەرخ لەبواری لایەنی مەعنەویو ئەخلاقیدا بەرهەمیان هێناون، کەهەموویان بریتین لەشەرحو لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی ئەو دەقانەی قورئانو سوننەت کەپەیوەندییان بەلایەنی ( تزكية النفس ) ەوە هەیە، چ لەڕووی عەقیدەو چ عیبادەتو چ ئەخلاقو ئادابی تاکیو خێزانیو کۆمەڵایەتییەوە، ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی دیکەشەوە ئەوە هەر وشەی ( تصوف ) نیە کەزانایان بۆ پێناسەو ناوونیشانی لایەنی مەعنەویو ڕووحی بەکاریان هێناوەو کردوویانەتە زاراوە ( مصطلح ) یێك، بەڵکو هەرکام لەزانایانی هەموو لقەکانی تری زانیارییە شەرعییەکان هەروایان کردووە، ئایا هیچ کام لەم وشەو زاراوانە لەسەردەمی پێغەمبەرو خەلیفە ڕاشیدینەکانیدا باو بوون: ( علم التفسير ) و ( علم الفقه ) و ( أصول الفقه ) و ( علم الكلام ) و ( التجويد ) و ( علم الجرح والتعديل ) . . . هتد؟

٥- (تصوف) و ڕێبازەکانی تەصەووف (طرق التصوف) لێك جیان:

هەرچی (تصوف) ە- کەئێمە وای بەپەسند دەزانین لەجیاتی وشەی (تصوف) وشەی (تزکیة) بەکاربێت، چونکە هەم وشەیەکی قورئانییەو هەم هیچ کەسیش لێی ناسڵەمێتەوەو بەگومانەوە سەیری ناکات- بەڵێ هەرچی (تصوف) ە بریتییە لەو بەرهەمو کەلەپوورو ئاداب و ڕێو ڕەسمانەی کەزانایانی پسپۆڕ (متخصص) لەپەروەردەکردنی ئینسانو چارەسەرکردنی دەردو نەخۆشییەکانی دەروونیدا، لەبەر تیشکی قورئانو سوننەتدا بۆیان بەجێهێشتووین، بەڵام ڕێبازەکانی تەصەووف ئەو دامودەزگایانەن کەبەهەق یان بەناهەق بەناوی (تەزکیەی نەفس) ەوە لەنێو کۆمەڵگای مسوڵمانانددا دەست بەکارن بۆ خزمەتی ئیسلامو مسوڵمانان لەو بوارەدا کەتێیدا پسپۆڕو شارەزاو کارامەن. کەواتە ئینسانی مسوڵمان بەبێ خۆبەستنەوە بەهیچ کام لەڕێبازو دامو دەزگاکانی تەصەووفەوە- مادەم قەناعەتی بەرەسەنایەتییان نەبێ- دەتوانێ لەدەریای پڕ گەوهەری عیرفانو تەصەووف بەهرەمەند بێتو بەتەڵەو داوی هیچ زڕە شێخێکی دڵنەخۆشی وەك مێخیشەوە نەبێ.

٦- هەڵوێستی زاناو پێشەوایانمان لەبارەی (تصوف) ەوە:

هیچ زانایەکی ڕۆچوو (راسخ) بەرامبەر بەمەسەلەی (تصوف) هەڵوێستێکی عاتیفیو سەرکێلانەی نەبووە، نەبەباری سلبی نە ئیجابیدا. بەڵکو هەموویان (کا) و (دان) یان لێك هەڵاواردووەو (ڕاست) یان قبوڵو (هەڵە) یان ڕەفز کردووە نەك هەر لە (تصوف) بەڵکو لەهەموو جۆرە کەلەپوورو بەرهەمەکانی تری زانایاندا لەهەر بارێکەوە بووبێ هەروایان کردووە.

بۆ وێنە: هەرکام لە (نووي) و (العز بن عبدالسلام) و (ابن تيمية) و (ابن قيم) و (سيوطي) و (ابن الهيتمي) و (ابن حجرالعسقلاني) لەپێشووەکانیانو (حسن البنا) و (سيد قطب) و (ابوالحسن الندوي) لەهاوچەرخەکانیان، هەم ڕەخنەو تێبینی زۆریان ئاراستەی هەڵەو پەڵەو خواروخێچییەکانی (تصوف) کردووەو، هەم هەدحو ستایشی زۆری لایەنە ڕاستو بەکەڵكو سوودبەخشەکانیشیان کردووە، ئەمە سەبارەت بەو زاناو پێشەوایانەی کەهەربەزاناو پێشەوا ناسراون هەرچەندە تۆختریںو پتەوترینو قوڵترین حاڵەتی تەزکیەو عیرفانیشیان تێدا بووە، ئەوانەش کەبە (تصوف) شۆرەتیان دەرکردووە هەرچەندە زانای زۆر پایە بەرزیش بوون، دووانیان لێ بەنموونە دێنینەوە: أ- (عبدالقادر) ی گەیلانی، ب- (الإمام الرباني).

هەرچی یەکەمیانە ڕەنگە کەم کەس هێندەی وی داکۆکی لەسەر

خوابەیەکگرتن ( التوحید ) کردبێ ، بڕوانە سەرنجی کتێبی ( الفتح الرباني ) بدە ، کەبەرهەمی خۆیەتیو کۆکراوەتەوە .

دووەمیشیان ، ئەوەندە بەسە بۆ پابەندی زۆری بۆ سوننەتەوە کەلەکتێبی ( مکتوبات ) ەکەیدا بەڕاشکاوی فەرموویەتی : بیدعەت هەمووی خراپەو ( حسنة ) ی نیە .

شایانیْ باسیشە کە ( عبدالقادر ) ی گەیلانی بەڕابەرو بنیادنەری ڕێبازی ( قادری ) دادەندرێ کەشوێنکەوتووانی لەکوردستانی ئێمەدا بە دەروێش ناسراونو ، ( سید أحمد ) ی سەرهەندیش کەبەئیمامی ڕەببانی ناسراوە گەورەترین ڕابەری ڕێبازی ( نەقشەبەندی ) یە کەشوێنکەوتواتی لەکوردستاندا پێیان دەگوترێ ( صۆفی ) .

٧- بیروڕای بەندە دەربارەی بەکارهێنانی وشەی ( سەلەفی ) یان ( صۆفی ) بۆ پێناسەکردنی مسوڵمانان :

( تصوف ) لایەنێكو بەشێکە لەئیسلام ، یان ڕاستتر بڵێین : ( تصوف ) بەرهەمو کەلەپوورو ڕێو ڕەسمێکە تەعبیر لەیەکێك لەلایەنەکانی ئیسلام دەکات ، کەلایەنی مەعنەویو ئەخلاقییە ، جادیارە کەئینسانیش بەگرتنی بەشێكو لایەنێك لەبەشو لایەنەکانی ئیسلام نابێتە مسوڵمانی تەواو عەیار ، وەلەڕاستیدا هیچ جیاوازی لەنێوان : صۆفی فلانو نوێژکەرفلانو ڕۆژووگرفلانو جیهادکەرفلانو حاجی فلانو . . . هتد دا نیە ، کەهەرچەندە لەبەر بارپێوەگرتنو ڕاهاتن هەندێك لەو شتانەمان وەك ( صۆفی فلان ) و ( حاجی فلان ) پێ سەیر نیە ، بەڵام ئەوانی ترمان پێ‌سەیرە .

( سەلەفیەت ) یش کەچەمكو واتای ڕاستو ئی هەڵەیشی هەیەو ، ڕاستەکەی بریتیيە لەشوێن‌پێ‌هەڵگرتنی زاناو پێشەوایانی پێشین ( سلف ) لەچۆنیەتی تێگەیشتنو وەرگرتنو پیادەکردنی ئیسلامدا ، چ لەڕووی عەقیدەو چ لەڕووەکانی تری ئیسلامەوە . چەمكو واتا هەڵەکەشی کەلەڕۆژگاری ئێستاماندا ئەمیان باوترە ، بریتییە لەجەختکردن لەسەر هەندێك مەسەلەو بابەتی فەرعیو جوزئی لەعەقیدەو عیبادەتو ئادابو هەڵسوکەوتدا کەزۆربەیان مشتومڕو جیاوازی ( خلاف ) یان لەسەرە ، وەلافلێدانی وەلانانی مەزهەبو ئیجتیهادی پێشەوایانو بەسەر هەڵهێنجان لەقورئانو سوننەت بەبێ شایستەییو . . . هتد .

بەڵێ . . . ( سەلەفیەت ) یش وەك ( تصوف ) ناگونجێ بکرێتە سەرچاوەی هەڵهێنجانی ( ناو ) بۆ ئینسانی مسوڵمان ، چونکە هەروەك چۆن ئینسان بەس بەگرتنی لایەنی ( تصوف ) و بەهرەمەندبوون لەو کەلەپوورەی کەبەو ناوەوەیە ناتوانێ بڵێ ئەو مسوڵمانەم کەخواو پێغەمبەرەکەی لەقورئانو سوننەتدا ویستوویانە ، بەهەمان شێوەش

تەنهابەوەندەی کەبەدوای ڕێوشوێنی زانایانی پێشین ( سلف ) دەکەوێو لەکەلەپوورو بەهەمو بیروبۆچوونەکانیان بەهرەمەند دەبێ ، کاری تەواو نابێو لەخەم نارەخسێ ، چونکە ئەوان هەرچەندە زۆر بەرزو بەڕێزو شارەزا بوون ، بەلام هەرباسی ئەو مەسەلەو بابەتانەیان کردووەو تەنها بەو جۆرە شەرحو تەفسیری قورئانو سوننەتیان کردووە کەلەڕۆژگاری خۆیاندا پێویستی کردووە ، بەلام ئێستا ڕۆژگارو بارودۆخو ئەحوالێکی تر لەگۆڕێ دایە ، کەپێویست دەکات ئێمەش ئیجتیهادی خۆمانی بۆ بکەینو یاساو حوکمی تری تازەو پڕبەپێستیش بۆ مەسەلەو ڕووداوو کارەساتەکانی هەڵهێنجین ، وێڕای بەهرە وەرگرتن لەبەرهەمو کەلەپووری زانایانی پێشینمان .

کەواتە : دەبێ مسوڵمان هەموو بەشولایەنەکانی ئیسلامی تێدا ڕەنگ بدەنەوە هەم ( سەلەفیەت ) هەم ( تەزکیە ) هەم ( شەرعزانین ) هەم ( جیهادکردن ) هەم . . . هتد ، بەلام هیچ کام لەم لایەنانەی ئیسلام ناگونجێ بکرێنە ناوو دروشم بۆ ئینسانی مسوڵمان ، چونکە مسوڵمان ئەو کەسەیە کەپابەندی سەرلەبەری ئیسلام بێ ، بەلام هەرکام لەناوەکانی ( سەلەفی ) و ( صۆفی ) و ( فەقیە ) و ( موجاهد ) تەعبیر لەبەشێکی ئیسلام دەدەنەوە نەك هەمووی ، تەنها لەحاڵەتێکدا بەکارهێنانی هەرکام لەو ناوانە بێ ئیشکال دەبێ ، ئەگەر لەبەر زاڵکردن ( تغلیب ) ی ئەو سیفەتەبێ لەبابای مسوڵماندا بەسەر باقی لایەنەکانی تریدا ، بەلام ئەوکاتەش درووست نیە دەمارگیری ( تعصب ) ی تێدا درووستبێ بۆ ناوەکەی خۆیو پاشانیش بیکاتە بناغەی دۆستایەتیو دوژمنایەتی ( الولاء والبراء ) ، چونکە ئەو کاتە هەر زۆر بەهەتڵەو لارێ لەقەڵەم دەدرێو ، مسوڵمان جگە لەناوی ( مسوڵمان ) نابێ ( تعصب ) و ( ولاءوبراء ) ی لەسەر هیچ ناوێکیتر بێت ، خوای زاناش ( جل جلالە ) لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هذا ﴾ الحج ( ٧٨ ) ، وەبائەو جۆرە بیرکردنەوە هەڵەیە لەمێشکی خۆمان دەرهاوێین کەپێیوایە مسوڵمان یان دەبێ سەلەفیبێ یان صۆفی ! لەلایەکی دیکەشەوە یان دەبێ مەزهەبی بێ یان قورئانو سوننەتی ! چونکە هەرکام لەم ناوو وەسفانە چەند ڕوویەکی یەك حەقیقەتنو بەهەموویانو گەلێك گەلێك وەسفو ناویتریش وەك ( عابد ) و ( سیاسی ) و ( فقیە ) و ( مقاتل ) ئەوجار دەتوانن تەعبیری تەواو لەمسوڵمانەتی بدەنەوەو پێناسەی مسوڵمان بکەن .

پوختەی قسان . . .

هیچ کام لەسەلەفیەت تێدابوونو ، تەصەووفهەبوونو ، پابەندبوون بەمەزهەبێکی فیقهیەوەو ، پابەند نەبوونو ، سیاسەتمەداربوونو ، جەنگاوەربوون . . . بەدیل نین بۆیەکترو بگرە تەواوکەری یەکتریشن . ئەگەر بابای مسوڵمان بیەوێو بتوانێ کەسایەتییەکی ئیسلامی هاوسەنگو هەمەلایەنەو تێرو تەواوی هەبێ .

٨- بۆچی ئەم کتێبەم ناونا ( ڕێگای صاڵحبوونو بەرەو خواچوون ) ؟ !

وەك سەرنجی ئەو ئایەتو فەرموودەو شوێنەواران ( آثار ) ەمدا کەپەیوەستن بەلایەنی مەعنەویو پاكوچاك ( تزکیة ) کردنی نەفسەوە ، بۆم دەرکەوتو بەتەجرەبەو ئەزموونی کردەیی خۆشم زیاتر حاڵیبووم ، کەئامانج لەپەروەردەکردنو تەزکیەکردنی نەفس دوو شتە ، یەکەم: چاکوپاك شایستەبوونو بەکەڵکهاتنو ئامادەبوونی بۆ نزیكبوونەوە لەخوای میهرەبانو پەروەردگار ، دووەم: شادبوونو گەیشتنی بەدیداری پڕ خێرو خۆشیو پیتو پێزی خوا- سبحانه وتعالی- کەلەدنیادا بریتییە لەناسینێکی ئەوتۆ کەچاکترین جۆرە بەندایەتیو پەرستنی لێ پەیدا دەبێو ، لەدوارۆژیشدا بریتییە لەگەیشتن بەبەهەشتە ڕازاوەو نەبڕاوەکەیو دیتنیو تەوەرامانی بەچاوی سەر ، وەك فەرموویەتی: ﴿ وُجُوهٌ يَومَئِذٍ ناضِرَةٌ ، إلى رَبِّها ناظِرَةٌ ﴾ القيامة ( ٢٢- ٢٣ ) ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: ﴿ إنَّكُم سَتَرَونَ رَبَّكُم عَياناً ﴾ (١) ، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ إذا دَخَلَ أهلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ ، يَقولُ اللّهُ تَبارَكَ وَتَعالى: تُريدُونَ شَيئاً أزيدُكُم ؟ فَيَقُولُونَ: ألَم تُبَيِّض وُجُوهَنا ، ألَم تُدخِلنا الجَنَّةَ وَتُنجِنا مِنَ النّارِ ؟ ! قالَ بَلى. فَيَرفع الحِجاب فَيَنظُرونَ إلى وَجهِ اللّهِ فَما أعطوا شَيئاً أحَبَّ إلَيهِم مِنَ النَّظَرِ إلى وَجهِ رَبِّهِم ، ثُمَّ تَلا: لِلَّذينَ احسَنوا الحُسنى وَزِيادَةٌ ﴾ (٢) .

هەربۆیەش خودای دادگەر دەربارەی کافرو لاڕێبووانی تاوانبار فەرموویەتی: ﴿ .. كَلّا إنَّ كِتابَ الفُجّارِ لَفي سِجّين. وَما أدريكَ ما سِجّين ؟ كِتابٌ مَرقومٌ. وَيلٌ يَومَئِذٍ لِلمُكَذِّبينَ. الَّذينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوم الدّين. وَمايُكَذِّبُ بِهِ إلّا كُلُّ مُعتَدٍ أثيم. إذا تُتلى عَلَيهِ آياتُنا قالَ أساطيرُ الأوَّلينَ. كَلّا بَل رانَ عَلى قُلوُبِهِم ماكانُوا يَكسِبُون. كَلّا إنَّهُم عَن رَبِّهِم يَومَئِذٍ لَمَحجُوبُونَ. ثُمَّ إنَّهُم لَصالوُا الجَحيمَ. .. ﴾ المطففين ( ٧- ١٦ ) ، وەك دەبینین: خوای دادگەر دوای ئەوی باسی هەڵوێستی چەوتی بێبڕوایانی خراپەکار دەکات لەئاقار بەرنامەکەیدا کەبریتییە لەبەئەفسانە لەقەڵەمدانی ئایەتەکانی قورئان ، ئەو ڕاستییە گرنگە دەخاتە ڕوو کەئەو کافرە تاوانبارانە لەسۆنگەی کردەوەی خراپو شوومی خۆیانەوە دڵو دەروونیان پەردەی ڕەشی تاوان دایپۆشیوەو گوناحو خراپەکاری ژەنگو کەمڕەی لەسەر دڵیان پەیداکردووە . ئنجا بەتووڕەییو تێوەخورینەوە ڕای گەیاندووە کەئەو بێبڕوا چەتوونو نەگبەتانە لەڕۆژی دواییدا پەردەپۆش دەکرێنو لەدیدارو دیتنی خوای میهرەبان بێبەش دەکرێن ، ئاخر چۆن خاوەن دڵودەروونێك شیاوی دیتنی خوایە کەلەژیانی دنیایدا بەژەنگو کەمڕەو چڵكو چەپەری تاوانو خراپەکاری ئەو دەروونەی خۆی ڕزاندوەو بێخێرو بێری کردووە .

---

( ١ ) رواه البخاري.

( ٢ ) رواه مسلم عن صهيب.

ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە کەخوای پەروەردگار سزای ( بێبەش کران لەدیداری خوا ) ی پێش سزای ( چوونە نێو ئاگری دۆزەخ ) خستووە ! ﴿ كَلا إِنَّهُم عَن رَبِّهِم يَومَئِذٍ لَمَحجُوبُون . ثُمَّ إِنَّهُم لَصالُوا الجَحيم ﴾ ، بەڵێ مادام بەپێی فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ کە ( مسلم ) گێڕابووی وەو پێش تۆزێك نووسیمان ، هیچ شتێك چاکترو خۆشەویستتر نەبێ لەلایەن ئەهلی بەهەشتەوە لە ( دیتنو بەدیداری خوا شادبوون ) ، دیارە بێبەشبوونیش لەو نیعمەتە هەرە بەرزو مەزنە لەهەموو ئازارو سزاو ئەشکەنجەیەك بێڕەزاترو ئەستەمترە .

جائێمە ئەو کتێبەمان ناونا ( ڕێگای صاڵحبوونو بەرەو خوا چوون ) چونکی ئومێدمان وایە هەرکەسێك چاك تێی بگاتو ڕەفتاری پێبکات کەمو زۆر پێ صاڵحو چاك دەبێو ، لەئەنجامی ئەو صاڵحبوونەشدا شایستەیی ئەوە پەیدا دەکات کەبەرەو ناسینێکی قووڵو ڕەسەنی خوا هەنگاو بنێو ، لەدنیادا بەچاوی عەقڵو دڵو ، لەدواڕۆژیشدا بەچاوی سەری خوای بێوێنە ببینێو بەدیداری بەرزو پیرۆزی شادبێت . بەڵێ ، هەروەك چۆن پاکیو چاکی مەرجی چوونە بەهەشتە ، وەك خوای کاربەجێ لەسەر زمانی فریشتەکانی بەبەهەشتییەکانی دەفەرموێ : ﴿ وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوا إِلى الجَنَّةِ زُمَرًا حَتّى إِذا جاءُوها وَفُتِحَت أَبوابُها وَقالَ لَهُم خَزَنَتُها سَلامٌ عَلَيكُم طِبتُم فادخُلُوها خالِدِين ﴾ الزمر ( ٧٣ ) بەهەمان شێوەش چوونە نێو بەهەشتی ناسینو پەرستنی خواوە پەکی لەسەر ئەو چاکیو پاکییە کەوتووە .

ئیدی بەهیوای ئەوە کەبەهۆی صاڵحبوونمانەوە شایستەی ئەوە بین کەوێڕای بەهەشت سەرزەوی خواش لەدنیا بەمیرات بگرینو وەبەر ئەو مژدەیەی خوا بکەوین کەدەفەرموێ : ﴿ وَلَقَد كَتَبنا في الزَّبُور مِن بَعدِ الذِّكر إِنَّ الأَرضَ يَرِثُها عِبادِيَ الصالِحُون ﴾ الأنبياء ( ١٠٥ ) .

٣٠ - ١١ - ١٩٩٥

• • •

# سێ تێبینیی گرنگ

١- مەسەلەی خۆپاککردنەوە لەخووو خدە بەدەکان ( الرذائل ) و خۆڕازاندنەوە بەخووو خەسڵەتە پەسندەکان ( الفضائل ) کەلەزاراوەی قورئاندا ( تزکیة ) ی پێدەگوترێو لەزاراوی عیرفانو ( تصوف ) یشدا ( التخلیة والتحلیة ) ی پێدەگوترێ، باسێکی یەکجار گرنگو مەزنەو ئەگەر بویسترێ بەتێروتەسەلیو لەئاستێکی بەرزداو بەشێوەیەکی وردو قووڵ بتوێژرێتەوە، دەبێ سەدان لاپەڕەی لەسەر بنووسرێن، بەڵام ( مالایدرك كله لایترك جله )، ئێمە مەبەستمان ئەوەبوو کەبەم کتێبە بابەتی ناوبراو بەشێوەیەکی کورتو گوشراوو لەئاستێکی ئاسایيو سادەدا بخەینەڕوو، بۆ شوێنکەوتووانی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بەگشتی، هەڵبەتە قەناعەتی تەواویشم لەسەر ئەوە هەیە کەهەرکەسێك بتوانێ بەتەواوی لەم کتێبە حاڵی بێتو ڕەفتاری پێبکات، پێویستی بەکەم سەرچاوان دەمێنێو تائەندازەیەکی چاك تێیدا بەمراد دەگات، چونکە ئەم نامیلکەیە لەگەڵ کورتيو کەم قەبارەییشیدا زۆربەی هەرەزۆری مەبەستە بنچینەییو گرنگەکانی ( تزکیةالنفس ) و، هەموو پایەو بنەڕەتە سەرەکییەکانی ڕێی بەرەو خواچوون ( السیر إلی الله ) ی تێدان.

ئنجا ئاشکرایە کەهەرکەسێکیش ئاستی هێندە پێهەڵچوو کەبەم کتێبە قەناعەت نەکاتو تینووایەتی نەشکێ، ئەوە دەشتوانێ بۆخۆی ڕاستەوخۆ لەسەرچاوە ڕەسەنو مەزنەکانی ( تصوف ) ەوە هەڵێنجێو، بابایەك دەستی بگاتە دەریایە حەوجێی چۆمیلکەو گۆمیلکان نابێ.

٢- من نەئەم نووسراوەو نەهیچ نووسراوێکی دیکەشم بەبێ هەڵە دانانێم، چونکە هەر یەگە کەبەسەهوو ناچێ! بەڵام خوێنەران دڵنیادەکەم کەئەم نووسراوە گوڵاوی وەدەستهێنراو لەچەندان چەپکە گوڵی ڕاپازنەراوی باغی خواناسيو تەقواو عیرفانەو، زادەی ئەزموونو تەجرەبەیەکی واقیعيو زاتییەو، لێبەهرەمەندبوونی- خوا پشتیوانبێ- شتێکی مسۆگەرو حەتمییە، بەمەرجێك بەویژدانەوەو بەدڵێکی ساغو سافو بێغەرەزەوە سەرنجبدرێو ڕەفتاری پێبکرێ.

٣- ئەو کەسانەش کەلەدەمی سەرنجدانو تێوەڕامانی بەرهەمەکانی بەندە، یان هەرکەسێکی دیکەشدا، پەردەیەکی ڕەشو تاڵ بەبەرچاوی خۆیانەوە دەگرنو پاشانیش وەك ئەنجامێکی سرووشتيو چاوەڕوانکراو، ئەگەر بەفری یەك شەوەشیان بێتە بەرچاو هەر بەڕەشو تاڵ دێتە بەر نیگایان، چاکترین چارەسەریان ئەوەیە کەپەردە ڕەشەکەی سەرچاویان لادەن، بۆئەوەی شتان بەڕەنگی سرووشتيو ئەسڵی خۆیان ببینن، چیدی زوڵم لەخۆیانو واقیعی جوانو گەشو ڕازاوەش نەکەن.

# ڕێ‌خۆشکردن

مسوڵمانی بەڕێزو شیرین !

گومانی تێدا نیە کەهەموو دەمێ گیروگرفتی مسوڵمانان لەخودی خۆیانو‌جۆری مسوڵمانەتی‌یەکەیانەوە پەیدا دەبێت، نەك لەئایینو بەرنامەکەیان .

جائەو گیروگرفتە چ چەوساوەیی‌و زەبوونی‌و کەساسی‌بێ، چستەمو خراپەو ڕەوشت نزمی‌بێ، چ‌چینایەتی‌و قڕی‌و بڕی‌و پڕی‌و بێ‌دادی‌بێ، چپەرتەوازەیی‌و تاقم ‌ماقمێنەو بێ‌سەرەوبەرەیی‌بێ .

کەواتە ڕێی چارەسەرمان هەر ئەوەیە کەزۆر بەتەواوی‌و بێ‌خڵتەیی لەبەرنامەی خودا حاڵی بین، ئنجا زۆر بەوردی‌و قووڵی چاو بەخۆماندابگێڕینو خۆمان بپشکنین، وەهەرجۆرە بیرروبۆچوونو خووخدەو هەڵوێستێکی هەڵەو لەگەڵ ئیسلامدا نەگونجاومان لەخۆماندا دی لەخۆمانی دابڕنین . بەواتایەکی دیکە ؛ قورئانو سوننەتان بکەینە بێژینكو پاك پاك خۆمان لەبێژینگ بدەین، هەتا هەست دەکەین کەبیروهۆشو دڵو دەروونو کەسایەتیمان هیچ جۆرە سەرکویزرو خڵتەوخاڵێکی پێوە نەماوە .

ئنجا ئەم کتێبەش تەرخان‌کراوە بۆ ڕوونکردنەوەو توێژینەوەی چۆنیەتی ئەو خۆپاك‌کردنەوەو خۆلەبێژینگ‌دانەی کەباسم کرد .

بەڵێ لەم کتێبەدا بەکورتی- بەڕای بەندە- ڕێگەی صاڵحبوونو بەرەو خواچوونو کامڵبوون لەشەش قۆناغاندا خراوەتەڕوو : قۆناغی یەکەم بریتی‌یە لە ( تۆبەکردنو پاکبوونەوە ) چونکە خودا پاکەو پاکی‌ی خۆش‌دەوێو ئینسان هەتا خۆی لەچڵكو چەپەری خراپەو تاوانان پاك نەکاتەوە ڕێی ناکەوێ هەر بەرەو خواش بچێ چجای ئەوەی لێی وەنزیك‌بکەوێ یان بەدیداری شادبێ !

وەقۆناغی دووەم بریتی‌یە لە ( زانابیو چاو ڕوونبوونەوە ) چونکە خودا لەبەر تیشكو ڕووناکی زانیاری‌و شارەزایی‌دا دەناسرێو دەپەرسترێ، دیسان یابای ڕێبوار دوای خۆشردنو ئامادەبوونی بۆسەفەرێ، نابێ هەتا تەواو لەو ڕێیەی پێیدا دەڕوات شارەزا نەبێو بەرچاوی خۆی نەبینێ بکەوێتە ڕێ .

قۆناغی سێیەمیش برتیی‌یەلە ( ئیخلاسو یەکلابوونەوە ) چونکە نیازی پاکی خواپێ‌مەبەستبوون بۆ هەر ئیشو کارێك بناغەیە، کاکڵە، هەوێنە، هەناوە، کەواتە یابای ڕێبوار ( سالك ) ی ڕێی بەرەوخوا چوون نابێ بەك شەقاو هەڵێنێ، هەتا تەواو تەواو دڵنیاو مسۆگەر نەبێ کەڕووی دڵی بەس لەخودایەو، جگە لەڕەزامەندی خودا هیچ نیازو مەبەستو ئاواتێکی دیکە لەئاوێنەی دڵیدا نیە .

ئنجا نۆرە دەگاتە سەر قۆناغی چوارەم کەجەرگەو هەناوو کاکڵو نێوەڕۆکی هەرشەش

قۆناغەکانە ئەویش ( پارێزکاریو وردبوونەوە ) یە ، بەڵێ بەدەستپێکردنی بڕینی قۆناغی چوارەم بابای ڕێبوار دەکەوێتە سەر خەتی ڕاستو بەرەو ناسینی خوداو پەیبردن بەناوو سیفەتە بەرزو پەسندەکانیو دیتنی جوانیو هەیبەتی ( الجمال والجلال ) ی دەست دەکات بەهەنگاونان ! !

ئنجا پاش جێگیربوونی خەسڵەتی ( پارێزکاریو وردبوونەوە ) لەدەروونی بابای مسوڵماندا ، قۆناغی پێنجەم دێتە پێش کەبریتییە لە ( ئیحسانو بەرزبوونەوە ) چونکە دوای پەیدابوونی خەسڵەتی پارێزکاری ( التقوى ) لەئینساندا ، ئینسان دەست دەکات بەپێهەڵچوونو کامڵبوونو لەخوا نزیکبوونەوەو . . . هتد .

وەکۆتایی ئەو سەفەرە بەرزو پیرۆزەمان بە ( دەوامو ساردنەبوونەوە ) هێناوە کەقۆناغی شەشەمو کۆتایییە ، چونکە دەوامو پشوودرێژیو ساردنەبوونەوەو کۆڵنەدان ، مەرجی حەتمیی بەئاکام گەیشتنی هەرکارێکە .

ئنجا پاش ڕوونکردنەوەی ئەو سەفەرە شەش قۆناغییە لە ( ١٥ ) خاڵاندا توێشووی ڕێگاش خراوەتە ڕوو .

جاعەزیزم !

ئومێدەوارمو لەخودای بەرزو بەخشەر داواکارم ، کەتۆش وەك خواناسانو ڕێبوارانی خواویستی ڕاستەقینەی بەگوڕو تینو عەزمبڕلاێینو دڵبڕ لەئەوین ، سەفەری خێرتبێو ئەم شەش قۆناغە یەك لەدوای یەك هەڵبوێریو لەئاکامدا ببیە مسوڵمانێکی کامڵی بەمرادگەیشتووی بەدیداری خودا شادبوو ، سوور سووریش بزانە کەدرووستبوونو پێگەیشتنی تۆو هاو وێنانت سەرچاوەی لاچوونی گیروگرفتانمانە ! چونکە خودا گفتو بەڵێنی داوەو فەرموویەتی : ﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ ﴾ الأنبياء ( ١٠٥ ) ، واتە : وەبێگومان لەپاش تەورات لەزەبووردا نووسیومانە کەزەوی ، بەندە چاکەکانمان بەمیراتی دەگرن .

بەئەندازەی ئەوەی کەئێمە خۆمان ( صالح ) دەکەین ، خودا ( إصلاح ) ی حاڵی خەڵکیمان پێدەکات ، بەتەعبیرێکی دیکە ؛ بارتەقای خۆگۆڕینمان ، واقیعو خەڵکمان بۆ دەگۆڕێ وەك خودا فەرموویەتی : ﴿ . . . إنَّ اللهَ لايُغَيِّرُ مابِقَومٍ حتَّى يُغَيِّروا مابِأنفُسِهِم ﴾ الرعد ( ١١ ) .

دەچا هاودینی شیرینم !

ئەگەر دەمانەوێ خودا لێمان ڕازی بێ بەهۆی جێبەجێکردنی ئەرکی سەرشانمانەوە ، باهەتا زووە لەچاككردنی خۆمان وەخۆبکەوین بەشکم وەبەر مژدەی خوا بکەوینو زەوی خوا بەمیران بگرین ! !

وما ذلك على الله بعزيز

• • •

## قۆناغی یەکەم

# تۆبەکردنو پاکبوونەوە

بەڵێ مسوڵمانی بەڕێز !

قۆناغی یەکەمینو یەکەم شەقاوی بەرەوخواچووڵانت ئەوەیە کەتۆبەیەکی ڕاستو ساغ لەگەڵ خودا بکەیو پەیمانی بەندایەتی لەگەڵ نوێ بکەیەوەو بەڵێنێکی ڕاستی پێبدەی کەلەهەموو هەڵەو پەڵەکانی ڕابردووت پاکت بکاتەوەو بتشواتو بتباتە ڕیزی ئەو کەسانەی کەخودا لەوەسفیاندا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ اللهَ يُحِبُّ التَّوابِينَ وَيُحِبُّ المُتَطَهِّرِينَ ﴾ البقرة (٢٢٢) ، واتە : بێگومان خوا تۆبەکارانی خۆشدەوێن ، هەروەها خۆپاککەرەوانیشی خۆشدەوێن .

ئنجا کەئەمەتکرد مانای وایە یەکەمین خەسڵەتی ئەو کۆمەڵە بڕواداره هەڵبژاردەیەت لەخۆتدا هێناوەتەدی ، کەخوا هەڵیان دەبژێرێ بۆ نوێکردنەوەو هێنانەوەی ئایینو بەرنامەی خۆی : ﴿ فَسَوفَ يَأتي اللهُ بِقَومٍ يُحِبُّهُم . . . ﴾ خوا خۆشی دەوێن .

جا ئێستا بەرلەوەی بچینە سەر ڕوونکردنەوەی چۆنیەتیو ماهیەتی ئەو گەڕانەوە ( توبة ) یە ، وای بەچاکدەزانم نەختێك گرنگیو بایەخی بخەینەڕوو :

عەزیزم :

هەروەك چۆن هەتا دەستنوێژت نەبێو جەستەو جلو بەرگتو ئەوشوێنەی کەلەسەری ڕادەوەستی پاك نەبێ بۆت نیە نوێژێ بکەی ، وەهەروەك چۆن هەتا لەلەشپیسی خۆت پاك نەکەیەوە ، ڕێی چوونە نێو مزگەوتو دەست لەقورئاندانت نیە ، وەهەروەك چۆن جوتیار هەتا زەویەکەی نەکێڵێو هەڵینەوژێرێ هیچی تێدا ناچێنێ ، بەهەمان شێوەش هەتا لەبێدەستنوێژیی سەرگەرمبوون بەدنیاوەو ، لەلەشپیسیی خراپەو تاوانەکانو ، لەگژوگیاو چرپو چاڵی سیفەتە بەدەکانو خووو خدە پیسەکان پاك نەبیەوە ، مەودای بەرەو خواچوونو لەخوانزیكبوونەوەت نیە ، چونکە بەدیداری‌خواشادبوون ئامانجو مەبەستێکی یەکجار بەرزو

پیرۆزەو ﴿ لايَمَسُّهُ إلاَّ المُطَهَّرونَ ﴾ الواقعة (٧٩) ،پاکبووەوان نەبێ دەستیان ناگاتێ (٣).

هەبۆیەش خوای زاناو میهرەبان تۆبە کردنی بەیەکەمین خەسڵەتی سەرەکی ئەو بڕوادارانە داناوە کەسەرو ماڵی خۆیان بەخوا فرۆشتووە: ﴿ إنَّ اللهَ اشْتَرى مِنَ المُؤمِنِين أنفُسَهُم وَأموالَهُم بِأنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ . . . التَّائِبونَ . . ﴾ التوبة (١١١-١١٢)

دیسان هەربۆیەش پێغەمبەری داتامان ﷺ فەرموویەتی: ﴿ الطُّهورُ شَطرُ الإيمان ﴾ (٤)، واتە: پاکی نیوەی بڕوایە. هەڵبەتە لێرەدا وشەی (طهور) ئەگەر پاکیی ڕواڵەتیش بگرێتەوە، زیاتر پاکیی مەعنەویی مەبەستە، چونکە دەگونجێ مرۆڤ ڕواڵەتی لەهەموو کەس پاکو خاوێنتربێو هێندەی دەنکە خەرتەلەیەکیش بڕوای لەدڵدا نەبێ چجای نیوە! (٥).

ئێستاش لەچەند خاڵێکدا نیوەرۆکو چۆنیەتی تۆبە دەخەینەڕوو:

---

(٣) یەکێکلەخواناسانی دڵبێدار لەوبارەوە فەرموویەتی: كيف يشرق قلب صور الأكوان منطبعة في مرآته؟ أم كيف يرحل قلب إلى الله وهو مكبل بشهواته؟ أم كيف يدخل الحضرة ولم يتطهر من جنابة غفلاته؟ أم كيف يفهم دقائق الأسرار وهو لم يتب من هفواته؟!!

واتە: چۆن دڵێك ڕووناك دەبێتەوە، كەوێنەی درووستكراوەكان لەئاوێنەكەیدا تۆماركراوە؟ واتە سەرگەرمی دنیایەو لەبەر خورما نایەڕژێتە سەر خوا. یان چۆن دڵێك كەبەكۆتو زنجیری ئارەزووەكانی داپێچراوە دەتوانێ بەرەو خوا بچێ؟ یان چۆن دڵێك ڕێی دەكەوێ بچێتە خزمەت دیداری خودا كەجارێ خۆی لەلەشپیسیی كەمتەرخەمییەكانی پاك نەكردۆتەوە؟ یان چۆن بەتەمایە لەنهێنییە-وردەكان حاڵیبێ كەجارێ لەوردە هەڵەكانی نەگەڕاوەتەوە؟!

بڕوانە: (إيقاظ الهمم في شرح الحكم) ب٢، ل٤٦٢.

(٤) متفق عليه.

(٥) زۆروونەدەچێ كەمەبەست لەم فەرموودەیە (الطهور شطر الإيمان) ئەوەبێ كەلەزاراوەی (تصوف) و (تزكية) دا پێی دەگوترێ (التخلية) واتە: خۆخاڵی كردن لەسیفەتو خووە بەدەكان (الرذائل) چونكە هەروەك زانایانی دڵبێدارو هوشیار فەرموویانە كاكڵی مسوڵمانەتیو خواناسی دوو شتە:

١- خۆپاككردنەوەو لەخۆدارنینی سیفەتو خووە ئاژەڵیو دڕندەییو شەیتانییەكان كەپێی دەگوترێ (التخلية). وەئیمامی غەززالی بەو خەسڵەتانە دەڵێ (المهلكات) واتە: فەوتێنەرەكان.

٢- خۆڕازاندنەوە بەو خەسڵەتو خووە پەسندە پاكو چاكانەی. كەلەفریشتەكاندا هەنو ئیمامی غەززالی بە (المنجيات) ڕزگاركەرەكان ناویان دەبات، ئەمەش لەزاراوەی (تزكية وتصوف) دا پێی دەگوترێ (التحلية).

وەبەهەردوكیان لە (تخلية وتحلية) (تزكية) پێكدێنن، (تزكية) ش وەك خودا فەرموویەتی ﴿ قد أفلح من زكاها ﴾ الشمس (١٠). كەواتە:

(تزكيه) لەیەك كاتدا مانای (تخلية وتحلية) هەردوكیان دەگەیەنێ، چونكە هەم مانای پاكبوونەوەو هەم مانای گەشەكردنیش دەگەیەنێ. بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن) ی راغب الأصفهاني، ل٢١٣.

## ١- تۆبە یانی چی؟

( تۆبە ) گەڕانەوە ، بەپێچەوانەی لێ‌حاڵی‌بوونی زۆربەی خەڵکی‌یەوە بریتی نیە لەوشەیەك کەبەزار دەگوترێ ، چونکە وشەی ( التوبة ) لەئەسڵی زماندا یانی گەڕانەوە ، وەشەرعیش هەر لەسەر ئەسڵی واتا زمانی‌یەکەی بەکاری هێناوە ، بەڵام تایبەتی کردووە بەگەڕانەوە بەلای خودا ( جل جلاله ) .

بەڵێ . تۆبە یانی وازهێنان لەگوناحو تاوانو خووخدەو ڕەفتاری خراپو ، بەدڵ پەشیمان‌بوونەوەو ، بەزمان دان بەتاوانباری خۆدا هێنانو ، پاڕانەوەو داوای لێبوردن‌کردنو ، بڕیاردان لەسەر نەگەڕانەوە سەر تاوانو خراپەو ، بەردەوام‌بوون لەسەر خواپەرستیو کردەوەی چاك ، وەبەئەندامەکانیش جێ‌بەجێ‌کردنی ئەو بڕیارەو سەلماندنی ڕاستی‌ی ئەو پەشیمان‌بوونەوەیە .

ئەوانەی بەزمان دەڵێن ( أستغفر الله ) بەڵام بەکردەوەو حاڵ هەربەردەوامن لەسەر حاڵو وەزعی پێشوویان ، بەس زمانیان گۆڕانی بەسەردا هاتووە ، دەنا ئەندامەکانیان هەر لەسەر بەزم‌وڕەزمی پێشوویان بەردەوامن ! ئەوانە لەڕاستیدا نەك هەر بەتۆبەکردوو لەقەڵەم نادرێن ، بەڵکو بەگاڵتەکردوو بەتۆبە لەقەڵەم دەدرێن !

چونکە تۆ یەکێك بانگت بکات بۆلای خۆی‌و بڵێ : بگەڕێوە لامو تۆش بەزار بڵێی : ئەوە گەڕامەوە . یان ئەوە دەگەڕێمەوە ! ! بەڵام بەکردار هەربەردەوام بی ، دیارە ئەو جۆرە ڕەفتارەت جگە لەگاڵتە پێ‌کردن هیچ تەفسیرێکی دیکەی نیە . جائێستا کەمەعناو نێوەڕۆکی تۆبەمان بۆ دەرکەوت ، بابزانین داخوا تۆبە چۆت دەکرێت ؟ !

## ٢- چۆن تۆبەی دەکەی ؟

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ﴿ مامِن رَجُلٍ يُذنِبُ ذَنبًا ثُمَّ يَقومُ فَيَتطهَّرُ ثُمَّ يُصَلّي رَكعَتَينِ ثُمَّ يَستَغفِرُ اللهَ لِذلك الذَّنبِ إلّا غُفِرَ لَهُ ﴾ (٦) ، واتە : هەرکەسێك تاوانێك بکات ، پاشان هەستێ خۆی پاك بکاتەوە- خۆی بشوات یان دەست‌نوێژێ بگرێ- ئنجا دوو ڕکات نوێژ بکات ، دوایی داوای لێ‌خۆش‌بوون لەخوا بکات ، بێگومان خوا دەیبەخشێ .

کەواتە :

خوێنەری شیرین ، مسوڵمانی بەڕێز ! ئەگەر دەتەوێ ڕێگای صاڵحبوونو بەرەو خواچوون بگری ! ئەوا هەنگاوی یەکەمت ئەوەیە کەبەنیازی تۆبەکردنو گەڕانەوە لای خوا ، خۆت بشۆی ،

---

(٦) أخرجه أهل السنن وقال الترمذي حديث حسن ، وصححه ابن حبان.

بشۆی ، یان ئەگەر بۆت ڕێنەکەوت دەستنوێژێکی پوخت بگری ، ئنجا بچوو دوو ڕکات نوێژی تۆبە بکە .

ئنجا هەتا دەتوانی سوپاسو ستایشی خوا بکەو صەڵاتو سەلام بۆ پێغەمبەر ﷺ بنێرە ، ئنجا چاوبەڕابردووی خۆتدا بگێڕەوەو هەموو ئەو تاوانو خراپانەی کەبەدڵو زمانو چاوو گوێو دەستو لاقو زارو گەدەو . . . هتد کردووتن وەبیر خۆتیان بێنەوە ، بەگەردنی کەچو ڕووی زەردو چاوی فرمێسکاویو دەنگێکی کزو بەلالآنەوەو کڕووزانەوە یەکبەیەك لەخزمەت خوادا بیانڵێو دانیان پێدا بێنەو ، پاشان بەشەرمەزاریو کڕووزانەوەو فرمێسك باراندنەوە دەست بەرز بکەوە ، یان کڕنووش بەرەو بڵێ :

خوایە من هەموو ئەو تاوانو خراپانەو زۆری دیکەش کەمن یان لەیادم نەماون یان هەر نەمزانیون ، کردوومنو لێیان پەشیمانمو دان بەهەڵەو ناتەواوی خۆمدا دێنم . بەڵام لێم ڕوونە کەتاوانو خراپەکانم هەرچەندە زۆربن ، لێبوردنی تۆ زۆرترەو ، هەرچەندە گەورەبن ، بەزەیی تۆ مەزنترە ، جاخوایە داوای لێبوردنو چاوپۆشیت لێ دەکەمو ، تۆش نائومێدم مەکەو بەلوتفو بەزەیی خۆت بمبوورە ، چونکە ئەگەر منیش شیاوی بەخشران نەبم ، تۆ شایستەی لێبوردنو بەخشینی ! !

ئنجا پاش ئەوە جارێکی دیکە چاوێکی ورد بەلیستەی گوناحەکانتدا بگێڕەوەو بزانە چەندیان پەیوەندییان بەس بەخواوەیە ، ئەوە ئومێد وایە ئەگەر تۆبەو گەڕانەوەکەت بەڕاستی بووبێ خودا لەهەقی خۆی ببورێ ، بەڵام ئەو تاوانو خراپانەی کەپەیوەندییان بەخەڵکەوە هەیەو مافی خەڵکیان خستوویەسەر ، ئەوە ئەو جۆرە گوناحانە وێڕای ئەوەی کەگوتمان چەند شتێکی دیکەش هەن دەبێ ڕەچاویان بکەی ئەگەر بتەوێ ئەوانیشت بۆ بسرێتەوەو یەکجاری ڕزگارت بێ .

جائێمە لەخاڵی سێیەمدا ئەو مەسەلەیە ڕوون دەکەینەوە :

## ٣- چۆنیەتی تۆبەکردن لەو گوناحانەی کەپەیوەندییان بەخەڵکەوە هەیە :

( أ ) چاو بەڕابردووی خۆتدا بگێڕەوەو زۆر بەوردی سەرنج بدەو بزانە داخوا هەرلەکاتی باڵغبوونتەوە هەتا ئەو سەعاتەی ئێستات کەتۆبەی تێدا دەکەی ، داخوا چ کەسێك مافێکی بەسەرتەوە هەیەو زیانێکت پێگەیاندووە ، جاچ غەیبەتت کردبێ ، چبوختانت پێوە کردبێ ، چ حەسوودیت پێ بردبێ ، چخۆت بەسەردا هەڵکێشابێ ، چدڵت شکاندبێ ، چ گاڵتەت پێکردبێ ، چماڵت خواردبێ ، چ گومانی بەدت پێبردبێ ، چ درۆت لەگەڵ کردبێ . . . هتد .

ئنجا کەهەموو ئەو کەسانەت وەبیرخۆت هێناوە کەمافێك یان چەند مافێکیان لەو جۆرە

مافانە لەسەرتە، بەدڵێکی غەمگینو چاوێکی بەگریانو ڕەنگی زەردو هەڵبزرکاوەوە، دەست بەرزبکەوەو بۆیان دەستبکە بەپاڕانەوەی گەرمو بەکوڵو هەوڵ بدە چاکترین دوعای دنیاو دوارۆژیان بۆبکەی، بەتایبەتی لەو بارەوە کەخۆت بەقەرزداری دەزانی، واتە:

ئەگەر بۆیە غەیبەتت کردبوو کەلەئابروو (سمعة) ی کەم بکەیەوەو لەپلەوپایەی نێو جەماوەری داشکێنی، داوا لەخوای بەرزو مەزن بکە کەناوو پلەو پایەی بەرزبکاتەوەو حورمەتو ڕێزی زیاد بکات. وەئەگەر بۆیە حەسوودیت پێبردووە چونکە زانیاریو تێگەیشتنی لەتۆ زیاترەو ڕەوشتو خووی لەئی تۆ بەرزترو جوانترە، لەخوا بپاڕێوە کەزانیاریو تێگەیشتنی پتر بکاتو ڕەوشتو ئاکاری پەسندتر بکات. وەئەگەر لەبەر دەوڵەمەندیو دارایی ڕقت لێی هەستاوەو هەوڵی زیان لێدانیت داوە، داوای بۆ لەخوا بکە، کەڕزقو ماڵی حەلاڵی بۆ زیاد بکاتو . . . وەهەروەها.

بەڵام گرنگ ئەوەیە بەدڵێکی ساغ بۆ ئەو خاوەن مافانە بپاڕێیەوەو لەقووڵایی دڵتەوە حەزبکەی خوا چی خێرو چاکەیە بۆیان بکات، نەك لەدەمی پاڕانەوەشدا شەیتانی بەدو پیس فێڵت لێبکاتو هەروا هاکەزاییو سەرسەرەکی دوعایان بۆبکەی ! !

ئنجا دوای ئەوە، بیر بکەوە بزانە کێیوا هەیە کە بەتبوغزێنێ، یان گومانی بەدت پێبەرێ، یان غەیبەتت بکات، یان ئازارت بدات، یان حەسوودیت پێبەرێ . . یان . . هتد، دوای ئەوەی یەك یەکی ئەوانەت لەئاوێنەی خەیاڵتدا ئامادەکردن، بەدڵو بەکوڵ بۆیان لەخوای میهرەبانو بەخشندە بپاڕێوەو بڵێ:

خودای پەروەردگار! تۆ لێبووردەیو لێبووردنت خۆش دەوێ، لەبەر ئەوە وامن لەهەموو ئەو کەسانە بووردم کەبەهەر جۆرێكو شێوەیەکبێ ئازارو زیانێکیان تووش کردووم، جاداوات لێدەکەم تۆش بەلوتفو بەزەیی خۆت بیانبەخشیو چاوپۆشییان لێبکەی (٧)، دەجا خوایە گیان هەروەك چۆن من لەمافەکانی خۆم بووردمو گەردنی ئەوانەم ئازادکرد کەئازارو زیانیان تووش کردووم، تۆش بەمیهرەبانیو بەخشندەیی خۆت من ببەخشەو مافی خەڵکیم لەسەر لابەرەو لەچڵكو چەپەری ئەو جۆرە خراپەو گوناحانە قوتارم بکە.

---

(٧) هەڵبەتەئەوە بەس بۆو کەسانەیە کەمسوڵمانن، چونکە پاڕانەوە بۆ نامسوڵمان درووست نیە، مەگەر دوعای هیدایەت بۆ داواکردن.

( ب ) دوایی هەوڵبدە هەرکەسێك ( ٨ ) کەبەهەر شێوەیەك زیانت لێداوەو دڵت ئازارداوە ، داوای لێبوردنو گەردن ئازایی لێبکەیو ، ئەگەر بگونجێو بزانی زیانی پتر نابێ ، دەقی ئەو ئازارو زیانەشی بۆ بگەڕێنەوە ، ئەگەرنا پێویست ناکات .

( ج ) وەهەوڵبدە مالی هەرخاوەن مافێکی زیندووت لەلایە بیدەوە ، ئەگەر مردبیش بیدەیەوە میراتگرەکانی ، ئەگەر نەشگونجاو مسوڵمانانیش ( بیت المال ) یکی ڕاستەقینەیان هەبوو ، بۆی بخە ( بیت المال ) ەوە ، ئەگەر نەشبوو بۆی بکە بەخێرو چاکەو بۆی ببەخشە .

جامسوڵمانانی بەڕێز !

ئەگەر بێتو ئەو شتانەی گوتران هەموویان یەك بەیەكو مووبەموو جێبەجێ بکەی ، ئەوە مسۆگەرو دڵنیابە ئەگەربێتو بەدڵێکی ڕاستوساغ ئەو تۆبەیەت کردبێو ، بێجگە لەڕازی کردنی خواو بۆ پاککردنەوەو لەخوا نزیکبوونەوە هیچیدیکەت لەدڵ نەگرتبێ ، ئومێدوایە کەتاوانو خراپەکانت هەرچۆنێکیو هەرچەندێکی بن ، خوای میهرەبان بەئاوو تەرزەو بەفری لووتفو بەخششی خۆی لێت بشواتو ، وەك قوماشێکی سپیی چاك شۆراو پاك بێیتەوە .

پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەرموویەتی : ﴿ التَّائِبُ مِنَ الذَّنبِ كَمَن لاذَنبَ لهُ ﴾ (٩) ، واتە : تۆبەکەر لەتاوانان وەك ئەوکەسە وایە کەتاوانی نین .

## ٤- نیشانەی گەڕانەوەی ساغ ( التوبة النصوح ) چیە ؟ !

ئنجا مسوڵمانی عەزیز ! دوای ئەوەی بەو شێوەیەی بەکورتی خرایەڕوو تۆبەتکرد ، ڕەنگە بتەوێ بزانی داخوا تۆبەو گەڕانەوەکەت لێوەرگیراوە یان نا !

هەڵبەتە هەقیشتەو زۆر جێی خۆیەتی کەهەوڵی زانینی وەرگیرانو وەرنەگیرانی تۆبەکەت بدەی ، بۆئەوەی ئەگەر بزانی تۆبەکەت وەرنەگیراوە ، لێی ڕانەوەستیو جارێکی دیکە سەرلەنوێ تۆبەکەت دووبارەو سێ بارەو چەندبارە بکەیەوە ، هەتا دەگەیە دڵنیایی تەواو ، گەتۆبەکەت وەرگیراوە ، چونکە هەروەك گوتمان مەبەستو ئامانج لەتۆبەکردندا شۆرانو پاکبوونەوەیە ، جاهەروەك چۆن ئەوکەسەی کەوا شتێك دەشوات ، ئەگەر بزانێ بەدەستێکی پاك نەبۆتەوە ، دەیکاتە دوو دەستو هەروەها هەتا خاوێنی دەکاتەوە ، ئێمەش پێویستە هەتا مسۆگەر

---

( ٨ ) ئەگەر دەتەوێ بەتێرو تەسەلی لەم مەسەلەی ( حق الناس ) ڕەتکردنەوەو چۆنیەتی خۆرزگارکردن لەو مافانە حاڵیبی بەوردی سەرنجی کتێبی ( الزواجر فی إقتراف الکبائر ) ی ابن حجرالهیتمی بدە ، باسی ( الکبیرة ) ل٤٦٣ ، ( ترك التوبة من الکبیرة ) ب٢ ، ل١٨١ .

( ٩ ) رواه ابن ماجة والطبرانی والبیهقی مرفوعا ورجاله ثقات .

نەبین واز نەیەنینو کۆڵ نەدەین .

ئێستاش بابێینە سەر نیشانەی وەرگیرانی تۆبە :

پێشەکی دەڵێم خودای گەورە فەرموویەتی : ﴿ يٰأَيُّها الذين آمَنوا توبوا إلى اللهِ تَوبةً نَصوحًا عسى رَبُّكم أن يُكَفِّرَ عَنكم سَيِّئاتِكم وَيُدخِلَكم جَنّاتٍ تَجري من تَحتِها الأنهارُ . . . ﴾ التحريم (٨) ، واتە : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ! بگەڕێنەوە بۆلای خوا بەگەڕانەوەیەکی ساغ ـ بێخلّتە ـ دڵنیابن (١٠) کەپەروەردگارتان ـ بەهۆی تۆبەی ساغەوە ـ خراپەکانتان لێبسڕێتەوە ، وەبتانخاتە چەند باغێکەوە کەڕووباریان بەژێردا دەڕۆن . . .

لەم ئایەتەوە دەردەکەوێ کەتۆبەی ساغو ڕاست ، حەتمەن خوای گەورە بەلوتفە بەزەیی خۆی وەری دەگرێو دەشیکاتە مایەی شۆرانو پاکبوونەوەی ئینسان لەخراپەو تاوانەکانیو شادبوونی بەبەهەشتی بەرین .

مادام وابێ هەرکاتێك تۆبە بەشێوەیەکی ڕاستو ساغو بێخلّتەکرا ، ئەوە مسۆگەر وەردەگیرێ ، کەواتە بابزانین تۆبەی ڕاستو ساغو بێخەوش چییەو نیشانەکانی چین ؟ !

دەتوانین لەچەند خاڵێکدا نیشانەکانی تۆبەی ڕاستو ساغو وەرگیراو بخەینەڕوو :

١ـ لەقوڵایی دڵیەوە بڕیارێکی قوولو پتەوو یەکجاری بدات :

یەکەم : لەبارەی ڕابردوویەوە ؛ هەر گوناحو تاوانو خراپەیەکی کردوویەتی زۆری لەسەر پەشیمان بێو نەگەڕێتەوە سەری ، وەمافی هەموو خاوەنمافێك بداتەوە ، یان گەردنی خۆیان پێ ئازاد بکات .

وەهەر چاکەو پێویستیو ئەرکێکی کەچواندوویەتی زۆری پێناخۆش بێو بڕوای وابێ کەگەورەترین زیانی لێکەوتووە .

دووەم : لەبارەی ئێستایەوە ؛ دەست لەهەموو خراپەو تاوانێکی وردو درشت هەڵگرێو ، قۆڵ لەجێبەجێکردنی هەموو ئەرکو پێویستییەکانی سەرشانی هەڵکات ، وەهەرچی لەڕابردوودا چواندوویەتی بیگێڕێتەوە .

سێیەم : لەبارەی داهاتوویەوە ؛ دڵی قایم بێ لەسەر نەگەڕانەوە سەر خراپەو

---

(١٠) چونکە زانایان فەرموویانە : ( عسى ) من الله واجبة ، واتە : هەرچەندە ( عسى ) لەزمانی عارەبیدا بەمەعنای ڕەنگەو لەوانەیە دێ ، بەڵام کەخوا بەکاری هێنا مەعناکەی دەبێتە حەتمیومسۆگەر ، چونکە هەروەك گوتراوە ( إن من عادة الكريم انه إذا أطمع أعطى ) .

تاوانەکانو بەردەوامبوون لەسەر چاکەو جێبەجێ کردنی پێویستی یەکان ( الفرائض ) .

٢ـ هەوڵبدات هەروەك چۆن کاتی خۆی بەهۆی شتی حەرامەوە ، یان بەهۆی گوناحو تاوانانەوە ، یان لایەنی کەم بەهۆی تەمبەڵی یەوە ، گۆشتو بەزی وەسەریەك ناوەو خۆی قەڵەوکردووە ، لەمەولا بەهۆی خواپەرستیو خۆماندووکردنو گریانو خەفەتخواردنو ئازاردانی نەفسەوە ، ئەو گۆشتو بەزە بتوێنێتەوەو بەمەعنای وشە خۆی قاڵ بکاتەوە .

٣ـ دەبێ پاش تۆبەکردن هەست بکات کەگوناحو تاوانەکان وەك ژەقنەمووتی تاڵو ناخۆشنو ، ئەوپەڕی تامو چێژیش لەخواپەرستیو کردەوە چاکەکان وەربگرێ .

٤ـ دەبێ لەخواردنو خواردنەوەو نووستنو قسەکردنو تێکەڵبوونی خەڵکی بگرێتەوە . ( پاشان پتر ئەم باسە دەتوێژینەوە ) .

ئەمانە هەندێك بوون لەدرووشمو نیشانە سەرەکی یەکانی تۆبەو گەڕانەوەی ڕاستو ساغ .

جامسوڵمانی عەزیز !

دوای ئەوەی بەم شێوەیەی گوتم تۆبەت کردو ئەو نیشانانەی خرانەڕووش لەتۆبەکەتدا دیتران ، ئەوە دڵنیابە ئەگەر خوا حەزبکات تۆبەکەت گیرا بووەو ، چاك چاك پاك بوویەوە .

مانای وایە ئێستا وەك بابایەکی بەدەستنوێژ بۆت هەیە نوێژی لەخوا نزیكبوونەوە دابەستیو وەك بابایەکی لەشپاك بۆت هەیە بچیە خزمەت ماڵی خواو دەست بۆ کتێبی خوا بەری .

وەوەك جوتیارێك کەزەوی یەکەی دەکێڵێو بژاری دەکاتو هەڵی دەوێژێرێ ، تۆش بەگاسنی تۆبەیەکی ڕاست زەوی دڵو دەروونی خۆت کێڵاوەو لەگژوگیار بچكوپاڵی گوناحو تاوانەکان هەڵتوێژارتووەو ئامادەی شت تێدا چاندنت کردووە .

مادا واشبێ ئەوجار بچۆ سەر قۆناغی دووەمو هەنگاوی دووەم هەڵێنەوە .

• • •

## قۆناغی دووەم

# زانیاریو چاو ڕوونبوونەوە

مسوڵمانی بەڕێزو خۆشەویست !

دوای ئەوەی قۆناغی یەکەمی بەرەو خواچوونت بڕیو تۆبەتکردو پاك بوویەوە ، مانای وایە ئێستا وەك ڕێبوارێك وای کەکەلو پەلو توێشووی ڕێیەی ئامادەکردووەو ئەوجار دەیەوێ بکەوێتە ڕێ ، بەڵام هیچ گومانێکی تێدا نیە هیچ ڕێبوارێکی ژیرو فامیدە ناکەوێتە ڕێو ملی ڕێیە ناگرێ هەتا تەواو لەپێچو پەناو کونو قوژبنی ئەو ڕێیە شارەزا نەبێ کەدەیەوێ پێیدا بڕوات .

کەواتە پێویستە تۆش ئێستا ـ پاش گەڕانەوەو پاکبوونەوەت ـ سەرگەرمی ئەوەبی داخوا سرووشتی ڕێی لەخوا نزیکبوونەوەو بەرەو خواچوون چۆنەو پێویستە چبکەیو چنەکەی ، دەنا ئەگەر خوانەخواستە بەبێ زانیاریو شارەزاییو پێش بەرچاو ڕوونبوونەوە بکەویە ڕێ ، زۆر نیزیکە ڕێگات لێ ونبێو شەیتانەکان گیرۆدەی کەندەلانو هەڵدێرو شوێنی عاسێت بکەنو بەمراد نەگەی .

وەزۆر چاك بزانە زۆربەی هەرەزۆری ئەوانەی بەنەزانیو بێئاگایی بەڕێی بەرەوخوا چووندا کەوتوونەڕێ ، نەك هەر نەگەیونە جێ ، بەگرە زۆربەیان سەریان لەزەندەقەو لاڕێبوونو گومڕاییەوە دەرچووە !

هەربۆیەش ئیمامی مالیك فەرموویەتی : « من تصوف بدون فقه فقد تزندق ، ومن تفقه بدون تصرف فقد تفسق ، ومن جمع بينهما فقد تحقق » ، واتە : هەرکەسێك بەبێ شارەزاییو زانیاری بیەوێ خۆی ساف بکاتەوە ئەوە بەرەو بێدینی دەچێ ، وەهەرکەسێك بەبێ خۆساف کردنەوە بیەوێ زانیاری پەیدا بکات ئەوە بەرەو بێبەندوباری و تاوانباری دەچێ ، بەڵام هەرکەسێك کۆیان بکاتەوە ، ئەوە هەقی پێکاوە .

هەڵبەتە خوای زاناش بەئاشکرا فەرموویەتی : ﴿ وَلاتَقْفُ مالَيسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ ﴾ الإسراء ( ٣٦ ) ، واتە : وەبەدوای شتێك مەکەوە کەزانیاریت دەربارەی نیە .

دیسان فەرموویەتی : ﴿ قُلْ هذِهِ سَبِيلِي أَدعُوا إلى اللهِ على بَصيرَةٍ ﴾ يوسف ( ١٠٨ ) ، واتە : بڵێ ئەمە ڕێبازی منە ، لەبەر ڕۆشناییدا بۆلای خوا بانگەوازی ـ خەڵك ـ دەکەم . .

جائێستا ڕەنگە بڵێی باشە ئەوە قەناعەتم هێنا کەبەبێ زانیاریو تێگەیشتنو بەچاوی خۆ دیتن ناگونجێ مرۆڤ بەرەو خوابچێ ، بەڵام ئاخر ئەو زانیاریو شارەزاییە چۆنەو چەندەو لەکوێ دەستگیر دەبێ ؟ !

لەوەڵامدا دەڵێین :

لەڕاستیدا مەبەستمان لەو زانیاریو شارەزایی‌یە تێگەیشتنو حاڵی‌بوونە لەئیسلام ، کەبەهۆی لێکۆڵینەوە دەربارەی قورئانو سوننەتو ئەو کتێبانەی شەرحو لێکدانەوەی وانن دەستگیر دەبێ . جابێگومان ئەمەش بەکەم کەس هەڵدەسوورێ ، کەواتە دەبێ لای کەم ( حد أقل ) ی ئەو زانیاریو شارەزایی‌یە دیاری بکەین کەدەتوانین بڵێین بریتی‌یە لە :

١ـ شارەزایی دەربارەی بنچینەکانی تێڕوانین ( تصور ) ی ئیسلامی سەبارەت بەبوونەوەرو ژیانو ئینسان .

٢ـ شارەزایی دەربارەی پایە بنەڕەتی‌یەکانی بیروباوەڕ ( عقیدة ) ی ئیسلامی .

٣ـ شارەزایی دەربارەی کاکڵو نێوەڕۆکی خواپەرستی ( عبادة ) بەگشتیو ، دەربارەی پێنج درووشمەکانیش ( نوێژ ، ڕۆژوو ، زەکات ، حەج ، زیکر ) بەتایبەتی .

جائێمە سوپاس بۆخوا هەم لەکتێبی ( بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامی ) کە ( ١٢ ) بەشەو ، هەم لەکتێبی ( مسوڵمانی کامڵ ) ئەم چوار مەسەلانەو گەلێك باسو بابەتی تریشمان توێژیونەوە (١١) ، کەهەتا ڕادەیەکی باش ڕێبوارانی ڕێگای بەرەو خواچوون لەهەر کتێبو سەرچاوەیەکی دیکە بێ‌ئیحتیاج دەکەن .



جامسوڵمانی بەڕێزو خۆشەویستم !

دوای ئەوەی ئەم قۆناغی دووەمی ( زانیاریو چاو ڕوونبوونەوە ) شت بڕی ، چ‌بەهۆی سەرچاوە ناوبراوەکانەوەو چ بەهۆی هەر سەرچاوەیەکی ترەوە ، ئەوجار خۆت گورجو گۆڵ بکەو بەرەو قۆناغی سێیەم هەنگاو بنێ کە :

( ئیخلاصو یەکلابوونەوە ) یە .

---

(١١) شایانی باسە کە ( بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامی ) ئێستا لەژێر چاپ دایەو ، ( مسوڵمانی کامڵ ) یش کەماوەیەك دەستنووسەکەی بزر بووبوو دوای ڕووداوەکانی مانگی ( ١٢ ) ی ( ١٩٩٣ ) ، ئێستا چارەیەکی چیە .

## قۆناغی سێیەم

## ئیخلاصو یەکلابوونەوە

مسوڵمانی عەزیزو شیرین !

دوای ئەوەی قۆناغی دووەمت بڕیو لەئاییینی خواو ڕێی بەرەو خواچووندا زانابوویو بەرچاوت ڕۆنبۆوەو زانیت ئەو ڕێیەی بەتەمای برینیی چییەو چۆنەو دەبێ چبکەیو چنەکەیو چۆن بکەی هەتا بتوانی بیبڕیوبگەیە مەنزڵو ببیە مسوڵمانێکی تەواوو کامڵ، مانای وایە ئێستا بەس پەکت لەسەر ئەوە کەوتووە کەناوی خوای لێبێنیو یەکەمین شەقاو هەڵێنیو بکەویە ڕێ ، مادام وابێ سەبرێ بگرەو خۆمەجووڵێنەو یەك شەقاویش هەڵمەیەنە هەتا ئەم قۆناغی سێیەمەش دەبڕی کەبریتیەیە لە ( ئیخلاسو یەکلابوونەوە ) . چونکە بەدەردی شاعیرێکی فارس گووتویەتی :

عبادت به اخلاص نیت نیکوست

وه گرنه آید زبی مغز پوست ؟ .

اگر جز به حق میرود جاده‌ات

در آتش فشانند سجاده‌ات

واتە : خواپەرستی بەنیازو مەبەستێکی بێخلتەوە چاکە ، دەنا توێلکی بێ کاکڵ چی لێ پەیدا دەبێ ؟ ئەگەر ڕێگەت بەلای غەیری خوادا بڕوات ، بەرماڵەکەت لێ دەئاگری دۆزەخ داوێن .

بەلێ چاوەکەم ! ئەگەر کردەوەکان تۆو بنو تەمەن زەوی بێ ، ئیخلاصو خواپێمەبەستبوون ( ئاو ) ەو بێگومان هیچ رووەکێکیش بەبێ ئاو نارِوێو گەشە ناکات ، کەواتە هیچ کردەوەیەکی چاکیش بەبێ خوا پێمەبەستبوون نایەتە دیو وەرناگیرێ .

بەلێ هەروەك چۆن ( شیر ) هەتا ( هەوێن ) ی تێنەکرێ نامەیێو نابێتە ماست ، هیچ جمو جۆڵو چالاکیەکیش بەبێ هەوێنی ئیخلاص نامەیێو بەکەڵك نایەت . هەربۆیش پێغەمبەری ڕابەرمان ﷺ فەرموویەتی : ﴿ كُلُّ امرِئٍ ذي بالٍ لم يُبدأ فيه بِبِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيمِ فَهُوَ

أبتَرٌ ﴾ (١٢) ، واتە : هەر ئیشێکی گرنگ کەبە ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾ دەستی پێنەکرابێ ئەوە دوابڕاوو بێخێرە !

چونکە لەدەمی ( بسم الله ) کردندا پێویستە مرۆڤ سێ شتی بەدڵدا بێن :

یەکەم : ئەم کارە بەس بۆ ئەوە دەکەم کەخوا لێم ڕازی بێو بەناوی ویەوە دەیکەم .
دووەم : ئەم کارە بەهێزو دەسەڵاتو شانو شەوکەتی خۆم نایکەمو بەیاریدەو توانای خوا ئەنجامی دەدەم .
سێیەم : ئەم کارە بەپێی ئەم شەرعو بەرنامەیە ئەنجام دەدەم کەخوا ناردوویەتی .

ئنجا گومانیشی تێدا نیە کەهەر کارێکی خێر یەکێك لەم مەرجانەی تێدا نەبێ ، خاوەنەکەی سەپانی پووشێیەو ماندووی بێ بەرهەمە .

دیسان هەربۆیەش لەسەرەتای نوێژەوەو پێش خوێندنی فاتیحە پێغەمبەرمان ﷺ فێری کردووین کەبڵێین : ﴿ وَجَّهتُ وَجهي لِلَّذي فَطَرَ السَّموات والأرض . . . ﴾ ، واتە : ڕووی خۆمم لەو زاتە کرد کەئاسمانەکانو زەوی بنیاد ناون .

بێگومان لێرەدا مەبەست لەڕووی خۆم ( وجهي ) نابێ ڕووی ماددیو ڕواڵەتی بێ ، چونکە مرۆڤ لەکاتی نوێژدا ڕووی ڕواڵەتیی بەرەو قیبلەیەو ، دیارە خوداش ( جل جلاله ) نەلەلای کەعبەو نەلەهیچ شوێنێکی دیکەش (١٣) نیە ، کەواتە مەبەست لە ( ڕوو ) لێرەدا ڕووی دڵودەروونو نیازو مەبەستە .

جامسوڵمانی خۆشەویست !

تۆش ئێستا بەرلەوەی بجوولێیو هەنگاو بنێی ڕووی دڵو نیازو مەبەستت بکە قیبلەی هەرە بەرزت کەخوای بەرزو مەزنو بەخشەرو داهێنەرو خاوەن لوتفو بەزەییەو ، تەواو دڵت ساغ و یەکلا بکەوەو بێجگە لە ( لەخوا نزیكبوونەوەو بەرەو بەرزیی بەرزبوونەوەو بەڕەزامەندی خوا شادبوونو کامڵبوونو تێگەیشتنو پێگەیشتن ) هیچ نیازو مەبەستو ئاواتو ئامانجو خولیایەکی دیکە لەدڵتدا مەهێڵەو پاك پاك نیازەکانی دڵو دەروونت بەبێژینگی قورئانو سوننەت دابێژەو ، بێجگە لەدەغڵی کاکڵدارو ساغی خوامەبەستبوونو بەرەو خوا چوون ئەوی دیکە هەمووی فڕێبدە .

بەڵام چاوەکەمبێ ! زۆر زۆر وریای خۆتبی بازیوانو بنژیلو گەنمی کوێرو لێدراوی نیازو

---

( ١٢ ) رواه أبو داود .

( ١٣ ) مەبەست ( لێبوون ) ی ماددیو بەرهەستە ، چونکە خوا نەلەزاتیو نەلە سیفەتەکانیدا وەك درووستکراوەکانی ناچێ ﴿ ليس كمثله شئ ﴾ .

مەبەستەکانی دیکە هەرچییەکی بن فێڵت لێنەکەنو خۆت لێ بەگەنم پێشان نەدەن، چونکە نەفسو شەیتان فێڵو فەرەجیان گەلێ زۆرن ! !

ئنجا بالەکۆتاییی ئەم باسەدا چەند قوڵە ئامۆژگارییەکیشت بکەم:

یەکەم: ئەگەر هەموو کەس فێڵی لێبکرێ فێڵ لەخوا ناکرێ، چونکە خودا وەك پێشەوامان فەرموویەتی ﴿ إنَّ اللهَ لايَنظُرُ إلى أجسامِكُم وَلاإلى صُوَرِكُم وَلكِن يَنظُرُ إلى قُلوُبِكُم ﴾ (١٤) ، واتە: بێگومان خوا نەتەماشای لەشو لارتان دەکات وەنەتەماشای دیمەنتان، بەڵکو تەماشای دڵەکانتان دەکات.

کەواتە عەزیزم پەلەپەلو تالووکە مەکەو هەتا تەواو دڵنیاو مسۆگەر نەبی کەڕووی دڵت جگە لەخوا لەهیچ شتێکی دیکە نیە، ئەم قۆناغە بەجێ مەهێڵەو مەکەوە ڕێ، چونکە ( شیر ) هەرچەندە زۆر چاکبێ بەبێ هەوێن نامەیێو دەترشێو، ئەگەر دنیایەش بەتۆووی داچێنی بەبێ ( ئاو ) سەوزنابێ، کەواتە هەتا ڕووی دڵت لەگەڵ خوادا ڕاست ڕاست نەکەیو تەواو خۆت بۆ خوا خاوێنو یەکلا نەکەیەوە هیچ مەکە، چونکە دیوارێك لەسەر زبڵی دابندرێ سەرەنجامی هەر ڕووخانو هەرەس هێنانە !

دووەم: هەموو جمو جۆڵو چالاکیو ڕەنجدانێکی بابای مسوڵمان بەمەبەستی ئەوەیە کەخوا لێی وەربگرێو پاداشتی بداتەوەو بەبەهەشتی بەرینو ڕەزامەندیی خۆی شادبکات، دەجا خودا بەڕاشکاوی ڕای گەیاندووە کەکاروکردەوەی هیچ کەسێك ئیعتیباری پێناکرێو وەرناگیرێ جگە خواناسانی ڕاستەقینەو پارێزکار وەك دەفەرموێ: ﴿ إنَّما يَتَقَبَّلُ اللهُ مِنَ المُتَّقينَ ﴾ المائدة (٢٧) ، واتە: بێگومان خوا بەس لەپارێزکاران وەردەگرێ !

کەواتە بابەر لەوەی هەنگاوێك بنێین تەواو لەخۆمان وردبینەوەو بزانین داخوا واین کەخوا لێمان وەربگرێ یان نا ! !

سێیەم: خوای میهرەبان لەفەرموودەیەکی قودسیدا فەرموویەتی: «أنا عِندَ ظَنِّ عَبدي

(١٤) رواه مسلم.

بێ » (١٥) ،واتە من بەگوێرەی گومانو بیرکردنەوەی بەندەکەمم سەبارەت بەمن .

کەواتە مسوڵمانی بەڕێز !

زۆرچاك بزانە بەبێ بۆخوا ساغبوونەوە هیچ شتێکت لێهەڵناوەرێ ،چەندە مەبەستت خوا بێو چەندە ڕەزامەندی خوات لەدڵدابێ خوداش هێندە تۆی مەبەستەو هێندە تۆی دەوێ !

بەکورتی ( خوا لەلای تۆ چۆن بێ ،تۆش لەلای وی ئاوای ! )

ئێستاش دوای ئەوەی تەواو تەواو دڵت بۆ خوا ساغو یەکلا بۆوەو بێجگە لەوەدەستهێنانی ڕەزامەنی ویو لێنزیكبوونەوەی هیچ ئاواتو مەبەستێکی دیکەی ماددیو مەعنەویت لەدڵدا نەماو جگە لەخوا هیچ شتێکی دیکە لەئاوێنەی دڵتدا بەدی ناکەی ،ئەمجار ناوی خودا بێنەو خۆت گورج بکەو بەرەو گرنگترینو کاریگەرترین قۆناغی ئەم سەفەری بەرەو خواچوونە برۆ کەبرتییە لەقۆناغی چوارەم ( پارێزکاریو وردبوونەوە ) .

• • •

---

(١٥) متفق علیە .

# قۆناغی چوارەم

## پارێزکاریو وردبوونەوە

مسوڵمانی بەڕێزو خۆشەویست !

ئێستا کەقۆناغی سێیەمت هەڵبواردووەو بەتەواوی ڕووت لەخودا کردووە ، جگە لەئامانجی بەدیداری خوداشادبوونو کامڵبوون هیچ نیازو مەبەستێکی دیکەی مەعنەویی وەك مەدحو پێهەڵگوتران و پلەوپایە وەدەستهێنانو ڕووی خەڵکی بەلای خۆدا هێنان ، یان ماددیی وەك دەسەڵاتو پارەو سامانو ئافرەتی جوان لەئاوێنەی دڵتدا نابینی ، ئەمجار خۆت گشتو وشت بکەو بچۆ قۆناغی ( پارێزکاریو وردبوونەو ) وە .

ئنجا بابەرلەوەی بچینە سەر ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی پارێزکاریو وردبوونەوە پێناسەیەکی کورتی پارێزکاری ( تقوی ) بکەینو برێك دەربارەی گرنگیو بەرهەمەکانی بدوێین :

سەرجەمی قسەو توێژینەوەی زانایان سەبارەت بەچەمكو واتای وشەی ( تقوی ) دەچێتەوە سەر ئەوە کە ( تقوی ) یانی ( وریاییو ئاگالەخۆبوونو خۆپاراستن ) ، بڕوێنە ( راغب الأصفهانی ) گوتوویەتی : « وصارالتقوی فی اصطلاح الشرع حفظ النفس عما یأثم » ، واتە : وەتەقوا لەزاراوی شەرعدا یانی ( خۆپاراستن لەهەر شتێك کەتاوانباریی تێدایە ) .

بەڵێ . . . ( تەقوا ) لەکوردیدا ( پارێزکاری ) بۆ داندراوە ، یانی چاودێریی خۆکردنو وریاییو بێداریو هۆشیاریو خۆپاراستن لەهەر نیازو مەبەستو قسەو وتارو کردەوەو ڕەفتارێك کەنارەزاییو ڕەنجانی خوای تێدایە . ئەو نیازو وتەو کردەوانەش کەدەبنە هۆی ڕەنجاندنو نارەزایی خودا سێ جۆرن :

یەکەم : نەکردنی شتێکی پەسندو چاك .

دووەم : کردنی شتێکی ناپەسندو خراپ .

سێیەم : زیادەڕۆیی کردن لەشتی حەڵاڵو موباحدا .

هەربۆیەش یەکێك لەهاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ لەوەڵامی یەکێكدا کەلێی پرسی تەقوا چییە ؟ گوتی : « هَل سَلَكتَ طَرِيقًا ذا شوكٍ ؟ » ئایاهیچ جاران بەڕێیەکی دڕکاویدا نەڕۆیوی ؟ گوتی : با ، گوتی : « فماذافَعَلتَ ؟ » لەو کاتیدا چیت کردوە ؟ گوتی : « شَمَّرتُ وَاجتَهَدتُ » خۆم گرجو گۆڵ کردووەو ئاگاداری خۆم بوووم ، گوتی « فَذلِكَ التَّقوی » دە ئائەوە تەقوایە !

ئنجا پاش ئەوەی تارادەیەك زانیمان تەقوا چیـیە ، بانەختێکیش دەربارەی گرنگیو بەرهەمو دەستکەوتەکانی بدوێین :

١- تەقوا دەبێتە هۆی زانایی‌و چاو ڕوونبوونەوە : ﴿ یاءَ یهاالذینَ آمَنوا إن تَتَّقواالله یَجعَل لَکُم فُرقانًا . . . ﴾ الأنفال (٢٩) .

٢- تەقوا والەمرۆڤ دەکات کەخوای لەگەڵ بێت : ﴿ . . . وَاعلَموا أنَّ اللهَ مَعَ المُتَّقین ﴾ التوبة (٣٦) .

٣- تەقوا دەبێتە هۆی لەقورئان حاڵیبوون : ﴿ ذلِكَ الکِتابُ لارَیبَ فیه هُدًى لِلمُتَّقین ﴾ البقرة (٢) .

٤- تەقوا والەئینسان دەکات کەخوا خۆشی بوێت : ﴿ . . فَإنَّ اللهَ یُحِبُّ المُتَّقینَ ﴾ آلعمران (٧٦) .

٥- تەقوا هۆی چوونە بەهەشتە : ﴿ إنَّ المُتَّقینَ في جَنّاتٍ وَنَهَرٍ ﴾ القمر (٥٤) .

٦- تەقوا مایەی لێکرانەوەی دەرووی خێرە : ﴿ وَمَن یَتَّقِ اللهَ یَجعَل لَهُ مَخرَجًا . . ﴾ الطلاق (٢) .

٧- تەقوا مایەی کاروبار بۆ ئاسنبوونە : ﴿ وَمَن یَتَّقِ اللهَ یَجعَل لَهُ مِن امرِهِ یُسرًا ﴾ الطلاق (٤) .

٨- تەقوادەبێتە هۆی پاداشتی مەزنو سڕانەوەی خراپەکان : ﴿ وَمَن یَتَّقِ اللهَ یُکَفِّر عَنهُ سَیِّآتِه وَیُعظِمْ لَهُ أجرًا ﴾ الطلاق (٥) .

٩- تەقوا قەڵغانە لەبەرانبەر فێڵ‌وپیلانی دووژمناندا : ﴿ . . وَإن تَصبِروا وَتَتَّقوا لایَضُرُّکُم کَیدُهُم شَیئًا . . ﴾ آلعمران (١٢٠) .

١٠- هەر ئیش‌وکارێك لەسەر بنچینەی تەقوا دابمەزرێ هەرەس نایەنێ : ﴿ أفَمَن أسَّسَ بُنیانَهُ عَلى تَقوى مِنَ اللهِ وَرِضوانٍ خَیرٌ أم مَن أسَّسَ بُنیانَهُ عَلى شَفا جُرُفٍ هارٍ فَانهارَ . . ﴾ التوبة (١٠٩) .

١١- سەرەنجامی خێر لەکردەوەی تەقواداران دایە : ﴿ . . . إنَّ العاقِبَةَ لِلمُتَّقین ﴾ هود (٤٩)

ئنجا بابزانین پارێزکاری‌و وردبوونەوە چیـیەو چۆنەو چۆن دەستگیر دەبێ ؟ !

باشترین ڕێگای وەدەستهێنانی پارێزکاری‌و وردبوونەوە ئەوەیە کەئینسان هەموو ڕۆژێك بەبێ بواردن بەگوێرەی ئەو پەیمانە پێنج بەندیـیە ڕەفتار بکات کە زانایانی دڵبێدارو هۆشیارو پارێزکار بۆ بەرەو خوا چوونو کامڵبوون دایان ناوەو لەسەری ڕێك کەوتوون .

ئەو پەیمانە پێنج بەندیـیەش بەکورتی ئاوایە :

١- مەرج لەگەڵدا گرتن ( المشارطة ) .
٢- چاودێری کردن ( المراقبة ) .
٣- سەرکۆنە کردن ( المعاتبة ) .
٤- لێپرسینەوە ( المحاسبة ) .
٥- سزادان ( المعاقبة ) .

چۆنیەتی ڕەفتارکردنیش بەپەیمانی ناوبراو بەم شێوەیەیە :

## هەنگاوی یەکەم : مەرج لەگەڵدا گرتن :

هەموو ڕۆژێ بەیانی زوو کەلەخەوێ هەستای بەعەزمێکی پتەوو پۆڵاییەوە خۆت بدوێنەو مەرج لەگەڵ نەفسی خۆتدا بگرە کەئاگاداری خۆی بێو وریاو بێدارو وردبێو نەیەڵێ گیرۆدەی هیچ خراپەو بێشەرعیەك یان ڕەفتارێکی پووچ ( لغو ) و ناپەسند ( مکروه ) بێ .

ئەو ئاگا لەخۆبوونو هوشیاریو وربوونەوەیەش بەپاراستنی حەوت شتان دێتە دی (١٦) :

١- وشەکان ( الکلمات ) : هیچ وشەیەك نەڵێو نەبیستێ کەتاوان بێ یان لانی کەم پووچو بێسوود بێ .

٢- سەرنجەکان ( النظرات ) : سەرنج نەداتە هیچ شتێك کەحەرامبێ یان لانی کەم پووچو بێسوود بێ .

٣- نیازەکان ( الخطرات ) : هیچ بیرو نیازێك بەدڵی خۆیدا نەیەنێ کەخراپ یان لانی کەم ناپەسند بێ .

٤- تاوەکان ( اللحظات ) : هیچ دەقیقەیەکی تەمەنی لە بێشەرعی یان پووچی ( لغو ) دا بەڕێ نەکات .

٥- هەنگاوەکان ( الخطوات ) : بەرەو هیچ کارێکی خراپ یان ناپەسند لاق هەڵنەیەنێ .

٦- پاروەکان ( اللقمات ) : هیچ پارووێك یان لوقمێکی وا لەگەرووی ئاوا نەکات کەنەك هەر حەرام بەڵکو جێی شوبهەش بێ .

٧- جموجۆڵەکان ( الحرکات ) : هیچ جموجۆڵێك بەهیچ کام لەئەندامەکانی نەکات کەحەرام یان ناپەسند ( مکروه ) بێ ، وەك تەسبیح ڕاوەشاندنو پەنجە تەقاندن . . .

---

(١٦) ئاشکراو بەڵگەنەویستە کەخەسڵەتی پارێزکاری ( تقوی ) بەس بەوەندە نایەتەدی کەئینسان ئاگاداری خۆی بێت دوورچاری هەڵەو تاوان نەبێت ، چونکە ( بەرد ) یش بەبەردایەتی خۆی هیچ گوناحان ناکات ، بەڵام هەر بەردەو بەس بەمە نابێ بەهیچ . کەواتە تەقوای ڕاستەقینە ئەوەیە کەوێڕای خۆلەخراپە پاراستن خۆشت لەچاکەدا سەرگەرم بکەیو هەوڵبدەی دەقیقەیەکیش جێیە لەکیست نەچێت .

## هەنگاوی دووەم: چاودێری کردن:

دوای ئەوەی بەو شێوەیەی کەلەهەنگاوی یەکەمدا باسمانکرد مەرجت لەگەڵ خۆتدا گرتو بەڵێنیکی پتەوت لەگەڵدا مۆرکرد، ئنجا دەستبەجێ دوابەدوای ئەوە چاودێریو پشکنینێکی وردو بەردەوام بخە سەر خۆتو زۆر چاك ئاگاداری وشەو ڕستەکانی زمانتو، ڕوانینو سەرنجەکانی چاوتو، نیازو مەبەستو خولیاو خەیاڵەکانی دڵو مێشکتو، چرکەو دەقیقەکانی تەمەنتو، پێهەڵهێنانو شەقاوەکانی لاقانتو، قمە خواردنەوەو پاروە خواردنەکانی زارو، جمو جۆڵی ئەندامەکانت بەو نەیەڵی ئەگەر لانی کەم خوداشیان پێ لەخۆت ڕازی نەکەی ببنە مایەی شەرمەزاریو ڕەنج بەخەساریو قەرزدار بوونەوەت ! !

هەڵبەتە ئەم چاودێریو ئاگا لەخۆبوونو خۆ پشکنینەش تایبەت نیە بەکاتو شوێنێکی تایبەتیو دیاری کراوەوەو، پێویستە هەر لەدەمی بێداربوونەوە هەتا کاتی پێش نووستن بەردەوام بێتو یەك تاو لەخۆی بێئاگا نەبێ، چونکە شەیتانو نەفس هەمیشە بۆ مرۆڤ لەبۆسە دانو هەر چاوەڕێی هەڵو دەرفەتێکن !

## هەنگاوی سێیەم: سەرکۆنەکردن:

ئنجا دوای ئەوەی هەر لەدەمی بێداربوونەتەوە هەتا کاتی سەر جێگەی خەوتن بەوردیو بێ پسانەوە چاودێری خوتت کردو چاوو گوێو زمانو زارو دڵو مێشکو گەدەو دەستو لاقو باقی ئەندامەکانت کردنە جێی سەرنجو تێوەڕامانو وردبوونەوەی خۆت، شەوێ کەچوویتە سەر جێگەی نوستنێ، مەنوو هەتا چاوێکی وردو قووڵ بەهەڵسو کەوتەکانی ئەو ڕۆژەتدا نەگێڕیەوە . جائەگەر خێرو چاکەیەکت دی، سوپاسی خوای لەسەر بکەو سوور بزانە کەبەیاریدەو پشتگیری خودا کردووتەو، ئەگەر خوا نەکردە خراپەیەکیشت بەرچاوکەوت ئەوە دەستبەجێ لێی ژیوان ببەوەو بگەڕێوە لای خواو داوای لێبووردنی لێبکەو سوورو سوور بزانە کەنەفست بەفەرمانی شەیتانی بەد تووشی ئەو چۆرتمەی کردوویو بەو دەردەی بردووی، مادام وابێ زۆر جێی خۆیەتی کەدەست بکەی بەتانە لێدانو لۆمەو سەرکۆنەی نەفست .

## هەنگاوی چوارەم: لێپرسینەوە:

پاش ئەوەی هەموو پێش خەوتنانێك لۆمەو سەرکۆنەی نەفسی خۆت کرد لەسەر هەڵەو تاوانەکانی، ئەگەر زانیت نەفست بەو سەرشکاندنەوەو خۆ لێتووڕەکردنو سەرکۆنە کردنە چاك بووەو ئەدەبو شەرمی پەیدا کردووە ئەوە چاکە، دەنا لەگەڵی بگوازەوە بۆ هەنگاوی چوارەمو بەین بەین هەر حەوتووی جارێك دەستبکە بەلێپرسینەوەیەکی زۆر توندو وردی نەفستو سەرە دەرزیانیشی لەسەر حیساب بکەو یەك تۆز بەزەییت پێیدا نەیەتەوە، چونکە ئەو بەزەیی بەتۆدا

نەهاتۆتەوەو ویستوویەتی لەرێی ئەو تاوانو خراپانەوە دووچاری توورەیی خوداو ئازارو ئەشکەنجەی دنیاو دوارۆژت بکات ! !

ئنجا ئەگەر لەئەنجامی ئەو لێپرسینەوەیەدا هەستتکرد کەنەفسی خراپەکارت شایستەی سزاو جەزرەبەیە ، ئەوە یەکسەر لەگەڵی بگوازەوە بۆ هەنگاوی پێنجەم .

## هەنگاوی پێنجەم : سزادان :

وەك گوتمان دوای لێپرسینەوەیەکی وردو قووڵ ئەگەر بۆت دەرکەوت نەفست شایستەی سزاو جەزرەبەیەو حەوجێی تەمبێ کردنێیە ، بەبێ سڵەمینەوەو دوودڵی بەرۆکی نەفست بگرەو زەبرێکی پڕ بەپێستی تێبسرەوێنەو لەخەوی سستیو تەوەزەلیو قالبگرانی وەخەبەری بێنەو ئەو کۆتو زنجیرەی کەشەیتانی بەد خستوویەتە دەستو پێو گەردنی‌یەوە بەشمشێری شەرع هەڵا هەڵای بکەو بیپسێنە .

هەڵبەتە جۆرو چۆنیەتیو ئەندازەی ئەو سزادانەش توێژینەوەی دوورو درێژ هەڵدەگرێ کەلێرەدا مەودامان نیە ، بەڵام میانەڕەوی ( وسطية ) ڕەچاوکردن لەهەموو شتێکدا نیشانە بەئینسان دەپێکێ .

کەواتە هەرکاتێك لەسەر تاوانو خراپەو کارێکی ناپەسند ویستت سزای نەفست بدەی لەلایەکەوە زەبرێکی وای تێبسرەوێنە کەئێشی پێبگەیەنێو پێی بگوترێ سزا ، لەلایەکی دیکەشەوە بائازاردانو سزادانەکە بەجۆرێکی هێندە سەختو بێڕەزا نەبێ کە بنەتۆوی خۆی نەکاتەوەو زیانی لەقازانجی پتر بێ (١٧) .

ئەگەر بێتو ئەوەی لەو پەیمانە پێنج بەندی‌یەدا خرایە ڕوو ، لەگوێو دڵ بگریو ڕەفتاری پێبکەی ، ئەوە مسۆگەربە بەپشتیوانیی خوا خەسڵەتی بەرزو پەسندو مەزنی ( پارێزکاری ) ت تێدا پەیدا دەبێو قۆناغی چوارەمیش هەڵدەبوێری ، ئنجا پتر خۆت گشتو وشت بکەو سەرت هەڵبڕەو بەرەو لوتکەی هەرە بەرزو پیرۆزی خواپەرستیو مسوڵمانەتی کەپلەی ئیحسانە بڕوانەو بیکە بەجێی خولیاو ئاواتی بەرزت .

• • •

---

(١٧) شایانی باسە کەمەرجنیە سزادان هەر لێدانو پێدادان بێت ، بەڵکو هەرشتێک کەببێتە مایەی تەمبێ کردنو سەرشکاندنەوی نەفس سزایە ، وەك برسی‌وتینوو کردنو حەپس کردن بەهۆی ئیعتیکافەوە . . .

## قۆناغی پێنجەم :

# ئیحسانو بەرزبوونەوە

مسوڵمانی سەنگین !

هەرکاتێك قۆناغی ڕابردووت بەتەواوی بڕیو خەسڵەتی پارێزکاریو وردبوونەوەت تێدا بوو بەشتێکی دامەزراوو بنەڕەتی ، مانای وایە کەوتوویە سەر خەتی ڕاستو بەرەو ئامانج بەڕێ کەوتوویو وەنزیکیش کەوتووی ، بەڵام بەس بەوەندە قەناعەت مەکەو خودا لوتفو بەزەییو بەخششی زۆرو زەوەندەیەو بەکەمی واز مەیەنە ، دیارە ئاواتی گەورەشە کەپیاوی گەورە درووست دەکات ، بەڵام ئاواتو مەبەستی بەرزیش ڕەنجو خەباتێکی لەقەدەر خۆی دەوێ ، چونکە ( إذا كانت الآمال كبارا تعبت في مرادها الأجسام ) ! !

بەڵێ برای شیرینم !

دوای ئەوەی لەئەنجامی هەڵبواردنی چوار قۆناغی پێشوودا گەیشتیە پلەو پایەی پارێزکاران ( المتقين ) ، ئەگەر لەخۆت ڕادەبینی بەوەندە مەوەستەو ، بەردەوامبە لەسەر ڕێ بڕین بەشکم ئەوە خوایە بتوانی بەلوتفی خوا خۆت بگەیەنیە پایەی ئیحسانو بچیە ڕیزی چاکەکاران ( محسنين ) ەوە !

ئنجا هەر هەمان ڕێگاو چۆنیەتی کە ( پارێزکاری ) ت پێ وەدەست هێنا ، پلەو پایەی ئیحسانیشی پێ دەستگیر دەکرێ ، ئەگەر خوا مەیلی لێبێ ، بۆیە بەپێویستی نازانم چۆنیەتی گەیشتن بەپایەی ئیحسان ( مقام الإحسان ) بتوێژمەوە .

بەڵام وای بەچاك دەزانم برێك چەمكو واتای ( إحسان ) ڕوون بکەمەوە .

( ئیحسان ) لەئەسڵی زماندا یانی چاکەکاری ، بەڵام لەزاراوی شەرعدا بەبڵندترین پایەی خواناسیو بەرزترین لوتکەی ڕێی بەرەو خوا چوون دەگووترێ .

بەڵێ ئیحسان ئەو حاڵەتە بەرزو پیرۆزەیە کەهەرکاتێك مرۆڤ پێی گەیشت هەموو ئەرکێکی ئیسلامی بەچاکترینو ڕاستترین شێوە ئەنجام دەدات ، نوێژەکەی لەوپەڕی چاکیو تەواویدا دەبێ هەم لەلایەنی ڕواڵەتیەوە وەك قورئان خوێندنو ڕکووعو کڕنووشبردنو تەحیاتەکەی ، وەهەم لەلایەنی دەروونیەوە وەك گەردنکەچیو خۆبەکەمزانینو خوا بەگەورەو پاك گرتنو بەدڵ لەخواوە ڕامانو دڵپڕبوون لەشەرمو ڕێزیی .

وەجیهادکردنەکەی بەتەواوترین شێوە دەبێو سەرو ماڵی لەسەر لەپی دەستی دادەنێ لەپێناوی بەرزکردنەوەی ناوی خواو بووژاندنەوەی بەرنامەکەیدا بێ ئەوەی چاوەڕێی سوپاسکردنو چاکەدانەوەی هیچ کەسێك بێ بێ جگە لەخوا .

وەهەروەها خوو ڕەوشتو ڕۆژوو وزەکاتو حەجو زیکرو هەموو شتێکی دیکەی بەهەمان شێوە .

کەواتە ئیحسانیش وەك تەقوا هەموو ئەرکو فەرمانەکانی ئیسلامو گشت نیازو وتەو کردارەکانی ئینسانو سەرلەبەری لایەنەکانی ژیانی دەگرێتەوە ، ئەوەندە هەیە چەند جیاوازییەکی ورد لەنێوان تەقواو ئیحساندا بەدی دەکرێن

١ـ تەقوا خەسڵەتێکە مرۆڤ لەخراپەو تاوانەکان دەپارێزێو بەرەو چاکەکاری هانی دەدا ، بەڵام ئیحسان خەسڵەتێکە مرۆڤ لەوشێوە خواپەرستییە دەپارێزێ کەشێوەیەکی چاکتر لەوی هەیە .

٢ـ تەقوا بۆ ئەوەیە مرۆڤ لەدۆزەخێ قوتار بکاو بەرەو بەهەشتێ تەیار بکات ، بەڵام ئیحسان دەبێتە هۆی ئەوەی کەمرۆڤ لەزیاتر پێهەڵاچوونی پلە بەرزەکانی بەهەشتێدا سەرگەرمی پێشبرکە ( مسابقة ) بێ !

٣ـ بەکورتی تەقوا پەرستنی خوایە ، بەڵام ئیحسان چاك پەرستنی خوایە . بابای پارێزکار ( متقی ) هەوڵ دەدات هەموو دەمێ لەنێوان چاکەو خراپەدا چاکە هەڵبژێرێ ، بەڵام بابای چاکەکار ( محسن ) هەوڵ دەدات لەنێوان چاکەو چاکتردا ، چاکتر هەڵبژێرێ !

جامسوڵمانی عەزیز !

وەك گوتمان ئیحسان لەهەموو شتێکدا هەیەو وردو درشت دەگرێتەوە ، بەڵام ئێمە لێرەدا بەهێنانەوەی دوو دەقی قورئانو سوننەت کەیەکیان پەیوەندیی بەلایەنی بیرو باوەڕەوە هەیەو ئەوی دیکەشیان پەیوەندی بەجۆری پەیوەندی مرۆڤەوە هەیە لەگەڵ خەڵکیدا ، واز لەتوێژینەوەی ئەم قۆناغە دێنین :

یەکەم : پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ سەبارەت بەچۆنیەتی ئیحسانـ ئەوپەری چاکیـ لەبروا بەخۆبوونو خواناسیدا فەرموویەتی : ﴿ الإحسانُ أن تَعبُدَ اللهَ كأنَّكَ تَراهُ ، فإن لَم تَكُن تَراهُ فإنَّهُ يَراكَ ﴾ (١٨) ، واتە : ئیحسان ئەوەیە کەبەشێوەیەك خوا بپەرستی کەدەیبینی ، خۆئەگەر تۆش ئەو نەبینی ئەو تۆ دەبینێ !

بێگومان ئەو حاڵەتەش هەروا بەسانایی بۆ ئینسان نایەتەدیو زۆری پێ دەوێ تاکو دەیگاتێ ، بەڵام مەحاڵیش نیەو هەرکەسێك بەڕاستی هەوڵی بۆ بدات بەلوتفی خوا پێی دەبەخشرێ .

دووەم : خوای بەخشەرمان فەرموویەتی : ﴿ الَّذينَ يُنفِقونَ فى السَّرّاءِ والضَّرّاءِ والكاظمينَ الغَيظَ والعافينَ عَنِ النّاسِ واللهُ يُحِبُّ المُحسِنينَ ﴾ آلعمران ( ١٣٤ ) ، واتە : ئەوانەی لەفەرحانیو تەنگانەدا ـ ماڵیانـ دەبەخشن ، وەرقی خۆ قوتدەرەوانو لەخەڵکی بووردوان ، وەخوا چاکەکارانی خۆش دەوێن .

بەڵێ ماڵ بەخشین لەکاتی دەوڵەمەندیو خۆشیو هەرزانیو فەرحانیدا زۆر کەس لەدەستیان دێ ، بەڵام هەموو کەس ناتوانێ لەکاتی تەنگدەستیو نەبوونیو شپرزەییدا پاروو لەزاری خۆیو

---

( ١٨ ) رواه مسلم.

خێزانی بگرێتەوەو لەڕێی خوادا بیبەخشێ !

وەکەسانێك هەن کەبتوانن لەدەمی تووڕەیی‌و ڕق هەستاندا بەسەر خۆیاندا زاڵبن‌و ئاگری تووڕەیی خۆیان کپ بکەن ، بەڵام بەدەگمەن هەڵدەکەوێ‌و زۆر کەمن ئەوانەی کەسەرەڕای ڕقی خۆ قوتدانەوەو خۆمەرزەم‌کردن‌و تۆڵە نەستاندنەوە ، هەستن دەست لەملی کابرای تاوانباریش بکەن‌و لێشی ببورن‌و داوای لێبووردنیشی بۆ لەخوا بکەن ! ! ( ١٩ ) .

ئنجا لەکۆتاییدا تێبینی‌یەکی گرنگ ماوە هەر دەبێ بگوترێ :

کەسێك ڕۆژێك لەڕۆژان بەهەڵکەوت پارووێك لەزاری خۆی‌و خێزانی بگرێتەوەو بیبەخشێ ، یان خۆوبەخت جارێك لەجاران بەخۆی بوێرێ‌و تاقەتی بەنەفسی بشکێ‌و ڕق‌وقینی خۆی قوت داتەوەو لەکابرای خراپەکارەش ببورێ ، ناگونجێ کەگومانی ئەوەی پێ ببرێ کەگەیوەتە پایەی ئیحسان ، چونکە گەیشتنە پایەی ناوبراو بەوە دەبێ کەئەو جۆرە خەسڵەت‌و هەڵوێستانەی تێدا دابمەزرێن‌و بۆی ببنە ( ملكة ) و عادەت ، دەنا هەوری درۆزنی هاوینانیش جاروبار گرم‌و هۆڕێکی دەکەن‌و ئاورشێنانیس وەدی دێنن ، بەڵام مەگەر مشتاخو بەروبوومی هەڵخراوی هەژارێك تەڕبکات ، دەنا چزەوی‌یان تێراو ناکات !

جاهاوبروای خۆشەویستم !

وەك پێشتر گوتمان پلەو پایەی ئیحسان چڵەپۆپەو لەتکەی هەرە بڵیندی مسوڵمانەتی‌یەو ، لەدوای وی پلەیەکی دیکە نیە ، کەخۆی بۆ بکوتی ، ئەوەندە هەیە هەرکام لەپاریزکاری ( تقوی ) وچاکەکاری ( إحسان ) لەزاتی خۆیاندا لەچەندان پلە پێكدێن‌و ، ئینسان هەتا لەپایەی ئیحساندا پتر ڕۆبچێ زیاتر بەرەو پلە بڵیندەکان بەرزدەبێتەوەو بەرزدەبێتەوە . . .

---

( ١٩ ) دەگێڕنەوە جارێکی کابرایەك جنێوو قسەی ناشیرین بەیەکێك لەخواناسانی پایە بڵند دەدات ، ئەویش ڕادەوەستێ هەتا جنێوەکانی تەواو دەکات پاشان پێی دەڵێ : کاکەگیان! ئەگەر ڕاست بکەی خوا لەمن ببورێ ، وەئەکەر درۆش بکەی خوا لەتۆ ببورێ! !

هەروەها جارێکی دیکە کابرایەك قسەی خراپی بەخواناسێك گوتن ، ئەویش پێی گوت : برای خۆم! ئەگەر من دۆزەخی بم شیاوی لەوەش خراپترم کەتۆ گوتت ، وەئەگەر بەهەشتی بم قسەکانی تۆ زیانێکم لێنادەن ، بڕۆ خوات لەگەڵ!

تێبینی :

هەڵبەتە ئەم ڕەوشتە بەرزە بەس لەگەڵ مسوڵمانانندا ڕەفتاری پێدەکرێ ، بەڵام لەگەڵ دوژمن‌و ناحەزاندا بەتایبەتی لەکاتی جەنگدا ئەوە یاسای «فمنِ اعتدی علیکم فاعتدوا علیه بمثل مااعتدی علیکم» البقرة ( ١٩٤ ) و «ولیجدوا فیکم غلظة» التوبة ( ١٢٣ ) دێتە پێش .

# قۆناغی شەشەم

# دەوامو ساردنەبوونەوە

مسوڵمانی شیرین !

وەك پێش تاوێك گوتمان پایەی ئیحسان مەنزڵگای کۆتایی سەفەری بەرەو خوا چوونەو لەدوای وی قۆناغێکی دیکە نیە ، کەخواناسان لەدنیا هەوڵی بۆ بدەن ، بەڵام ئێمە بۆیە ( دەوامو ساردنەبوونەوە ) مان کردە قۆناغی شەشەمی سەفەری بەرەو خوا چوون ( السير إلى الله ) چونکە هیچ شتێك بەبێ پشوو درێژیو بەردەوامی و ساردنەبوونەوە نایەتە دی .

بەڵێ ئینسان بەکۆڵنەدانو پاشەکشەنەکردنو ساردنەبوونەوەو پشوودرێژیو خۆڕاگریو بەردەوامی لەهەر شتێکدا کەهەوڵی بۆ دەدات بەمراد دەگاتو بێئەوە هیچی بۆناکرێو داری هەوڵی بەر ناگرێ !

هەربۆیەش خوای زانا لەزۆر جێی قورئانیدا مەدحی ئەوانەی کردووە کەخۆڕاگر ( صابر ) و خاوەنی بەردەوامی ( استقامة ) ن ، بۆ وێنە فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ . . ﴾ فصلت ( ٣٠ـ٣١ ) ، واتە : بێگومان ئەوانەی دەڵێن : پەروەردگارمان خوایە ، وەخۆڕاگرو بەردەوامیش دەبن ، فریشتەکان دێنەسەریان۔ پێیان دەڵێن۔ کەمەترسنو دڵتەنگ مەبن ، وە موژدەتان لێبێ بەو بەهەشتەی کەبەڵێنتان پێ درابوو ، ئێمە لەژیانی دنیاو لەدوارۆژدا دۆستتانین .

وەلەچەند شوێنێکدا فەرمانی بەپێغەمبەرمان کردووە کەپایەدارو بەردەوامبێ ، بۆوێنە : ﴿ فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ . . . ﴾ هود ( ١١٢ ) ، واتە : جاوەك فەرمانت پێکراوە بەردەوامبە . . .

پێغەمبەری زانای خۆڕاگریشمان ﷺ فەرموویەتی : ﴿ أحبُ الأعمالِ ألى اللهِ تعالى أدوَمُها

وَإِن قَلَّ ﴾ ( ٢٠ ) ، واتە : خۆشەویستترین کردەوە لەلای خوای بەرز بەردەوامترینەتی ئەگەرچی کەمیش بێ .

جامسوڵمانی شیرینو سەنگین !

هەتا دەتوانی خۆڕاگرو پشوودرێژو بەردەوامبەو پەند لەو دڵۆپە بەردەوامە نەسرەوتووە وەربگرە کەشەوو ڕۆژ چکەچکیەتیو لەئاکامدا بەردی ڕەق قووڵ دەکات ، وەپەند لەو دڵۆپە ورردیلانەی بارانێ وەربگرە کەسەدان ڕووبارو دەریای زل زل درووست دەکەن ! !

وەپەند لەو مێروولانە وەربگرە کەبەهۆی ئیش کردنی بەردەوامەوە هەزاران دەنکە دانەوێڵە وەسەرێك دەنێنو بۆ کاتی پێویستی پەزمەندی دەکەن ! !

وەپەند لەو مێشەنگوینە چالاکانە وەربگرە کەبەو زارو چەنگۆڵە گچکانەی خۆیان چەندان شانە هەنگوینی شیرین نەشیلەی گوڵان درووست دەکەن ! !

• • •

---

( ٢٠ ) متفق عليه .

## بەچی بەرەو خوا بچینو پێهەڵاچین ؟

مسوڵمانی بەڕێز !

دوای ئەوەی زانیت چۆن بەرەو خوا دەچیتو بەچەند قۆناغاندا تێپەڕ دەبیو کەنگێ بەئامانجت دەگەیو کامڵ دەبی ، پێویستە بزانی ئەو وەسیلەو بژێوو توێشووە چی‌یە کەڕێی ناوبراوی پێدەبڕی ، جالەبەرئەوەی ئێمە لەکتێبی ( مسوڵمانی کامڵ ) دا بەتێرو تەسەلی دەربارەی ئەو بژێوو توێشووە دواین ، لێرەدا بەپێویستی نازانم زۆری لەسەر بڕۆمو هەروا بەکورتیو ڕاپازنەراوی لەچەند خاڵێکدا مەبەست ڕادەگەیەنم :

### ١- نوێژ :

نوێژ گەورەترین وەسیلەو هۆی بەرەو خوا چوونو لەخوا نزیکبوونەوەیەوچاکترین توێشووی ئەو سەفەرە مەزنەیە ، کەواتە هەتا پێت دەکرێ ئاگاداری بەو بامەرجە ڕواڵەتیو پەنهانەکانی تێدا بێنەدی ، وەهەوڵبدە هەموو جۆرە نوێژە سوننەتەکان بکەی بەتایبەتی ڕەواتیبو وەترو شەونوێژو نوێژی چێشتەنگاو ، وەبەکۆمەڵ نەبێ نوێژە فەرزەکان مەکە .

### ٢- زیکر :

زیکرکردن بەدڵو زمان ، دوای نوێژ چاکترینو کاریگەرترین هۆی لەخوا نزیکبوونەوەو گەورەترین توێشووی ڕێی بەرەو خوا چوونە ، جابێگومان زیکریش جۆری زۆرنو هەرجۆرە بۆقۆناغو حاڵەتێکی تایبەتی گونجاوترە ، بۆوێنە زیکری ( استغفر الله ) بۆحاڵەتی تۆبەکردنو ، زیکری ( الحمد لله ) بۆحاڵەتی هەست بەنازو نیعمەتکردنو . . . هتد .

بەڵام ئەوەندە بزانە زیکر ئەگەر لەدڵەوە سەرچاوە نەگرێ جووڵانی ڕووتی زمان هیچ نیە .

### ٣- قوڕئان خوێندن :

کەگەورەترین جۆری زیکرەو لەهەموو جۆرە زیکرەکان تەنانەت لە ( لا إله إلا الله ) کردنیش کەگەورەترین وشەیە ، چاکترەو خێری پترەو ، کاریگەرتریشە ، بەڵام ئەمە زیاتر بۆ کەسێکە کەلێی حاڵی‌بێ .

ئەوەندەش بزانە کەبەئەندازەی لەخوا نزیکبوونەوەت لەکتێبەکەی حاڵی دەبی ، چونکە

هەتا زیاتر کەسێك بناسی پترلەقسەکانی دەگەی !

## ٤- ڕۆژووگرتن :

ڕۆژووگرتنیش یەکی دیکەیە لەهۆو وەسیلەی هەرە کاریگەری لەخوا نزیك‌بوونەوە ، چونکە بەهۆی ڕۆژووەوە بەسەر نەفستدا زاڵ دبیو دڵت ڕوون دەبێتەوەو سەرکێشیو دڕندایەتیو ئارەزووپەرستی نەفست کەم دەبێتەوە .

کەواتە سەڕای ڕۆژووی فەڕز هەوڵبدە ڕۆژووی سوننەتیش بگری ، وەك لەهەر مانگێ سێ‌ڕۆژ کەلای کەمی ڕۆژووگرتنی سوننەتە ، یان پێنج‌شەممەو دووشەممانی هەر هەفتەیەك ، یان ئەگەر بتوانی هەر ڕۆژنا ڕۆژێك ، کەپێغەمبەر ﷺ بەچاکترین جۆری ڕۆژووگرتنی لەقەڵەمداوەو فەرموویەتی عادەتی حەزرەتی ( داود ) بووە ، علیه‌السلام ، وەك بوخاری گێڕاویەتەوە .

## ٥- یارمەتیدانی خەڵکی :

یاریدەدانی خەڵکیش بەدەستو زمان یان بەماڵو سامان یان بەهەر شێوەیەکی دیکە ، دەورێکی یەکجار گرنگو بەرهەمدار دەبینێ لەبڕینی ڕێی بەرەو خوا چووندا ، چونکە یارمەتیدانی غەیرو چاکە لەگەڵدا کردنی بەرزترین سیفەتی خوای میهرەبانەو ، دیارە ئینسانیش هەتا زیاتر بتوانێ سیفەتە بەرزو پەسندەکانی خوا لەخۆیدا بێنێتە دی زیاتر لەخوا نزیك دەبێتەوە ، خوداش فەرموویەتی: ﴿ . . . وَأَحسِنوُا إنَّ اللهَ يُحِبُّ المُحسِنِينَ ﴾ البقرة ( ١٩٥ ) .

## ٦- بیرکردنەوە :

بیرکردنەوەش لەبوونەوەرو دیاردە سەرسامکەرەکانیو لەنەفسو حاڵەتە سەیرەکانیو لەمێژوو وکارەساتو ڕووداوە پەندبەخشەکانو لەناوو سیفەتە بەرزەکانی خواو ئایەتو فەرمودەکانی ، یەکی دیکەیە لەتوێشووە هەرە بەنرخەکانی سەفەری بەرەو خوا چوون (٢١) .

## ٧- پاڕانەوە :

پاڕانەوە ( الدعاء ) کەپیرۆزترین جۆری زیکرە بەمەرجێك ئەو ئەدەبو مەرجانەی تێدا ڕەچاوبکرێن کەقورئانو سوننەت خستوویانەنەڕوو ، بەیەکێك لەهۆو وەسیلە هەرە گرنگو

---

( ٢١ ) هەروەها بیرکردنەوە لەمردنو کارەساتەکانی دوای مردنیش دەورێکی گرنگی هەیە لەصاڵحبوونو بەرەو خوا چوونی ئینساندا .

کاریگەرەکانی لەخوا نزیكبوونەوە دادەندرێ .

ئەوەندەش بزانە کە گرنگ ئەوەیە خوا جۆری پاڕانەوەکەت فێربکا دەنا وەڵامدرانەوە ئاسانە ، چونکە خودا بەخشەرو میهرەبانەو هەرکاتێك جۆرە پاڕانەوەیەکی فێرکردی سوور بزانە بەخۆڕایی نەیخستۆتە دڵتەوەو دەیەوێ وەڵامیشت بداتەوە . وەبشزانە کەجۆرو چۆنیەتی پاڕانەوەکەت لەگەڵ ئاستو قۆناغی بەرەو خواچوونتدا گونجاوو پێکەڵپێکە .

## ٨- حەج :

حەجیش کەجۆرە خواپەرستی‌یەکی ڕووحیو فیکریو سیاسیوئابووریو کۆمەڵایەتی‌یە ، دەورێکی یەکجارمەزنو گرنگ دەبینێ لەبەرەو خوابر نی مرۆڤو بەرزکردنەوەیدا بەرەو پایە بڵیندەکانی ئیمانو ئیسلامو تەقواو ئیحسان .

## ٩- ئیعتیكاف :

( إعتكاف ) یش کەبریتی‌یە لە ( مانەوە لەمزگەوتدا بەمەبەستی عیبادەت بەچەند مەرجێکی تایبەتی‌یەوە ) وەسیلەیەکی یەکجار گرنگو کاریگەرە بۆ پاکبوونەوەو گەشەکردنی دڵو دەروونو بەرەوخواچوون (٢٢) .

## ١٠- جیهاد :

جیهادکردن لەپێناوی بەرزکردنەوەی ناوی خودا نەك ناوی خۆت ! وەلەپێناوی بووژاندنەوەی ئیسلامدا ، بەدڵو زمانو قەڵەموماڵو گیان ، کاریگەرترین دەور دەبینێ لەپێهەڵبردنی ئینساندا ، بەرەو پلەبەرزەکانی ئیسلام ، چونکە ئینسان لەگەرمەی جیهادی ڕاستو ساغدا دووچاری سەدان کۆسپو تەگەرەو دەردەسەریو گرفتاری دەبێو هەزارەها تاڵو سوێری دەچێژێو نەمامی دەیان گرفتو ناسۆری بەسفتوسۆ لەزەوی دڵیدا دەنێژێ ، دیارە لەبەرانبەر ئەوەشدا خوای بەرزو مەزن خراپەو تاوانەکانی دەسڕێتەوەو بەچاکترین شێوە پاداشتی دەداتەوە .

دیسان لەجەنگەی خەباتو تێکۆشانو بەشەڕهاتن لەگەڵ نەفسو شەیتانو ناحەزاندا پەی

---

( ٢٢ ) بۆئاگاداربوونی تەواو لەچۆنیەتیو یاساکانی ( إعتكاف ) دەتوانی سەرنجی تەفسیری ( قورطوبی ) بدەی : ب٢ ، ل٣٣٢-٣٣٧ .

بەخەسڵەتو خوە بەدو خراپەکانی هەڵەو ناتەواویەکانی دەبات (٢٣) .

## ١١ـ خوو و ڕەوشتی پەسند :

یەکی دیکە لەو هۆو وەسیلانەی بەچاکترینو گرنگترین توێشووی سەفەری بەرەو خواچوون دادەنرێن بریتی‌یە لەخوو ڕەوشتی بەرزو پەسند .

بەڵێ خۆڕازاندنەوە بەخەسڵەتە بەرزو جوانەکان کەلەکتێبی ( مسوڵمانی کامڵ ) دا ( ٦٣ ) شەستو سێ دانەمان لێ نووسیون ، وەڕەفتارکردن بەشێوەیەکی ڕاستو دروستو شەرعی‌یانە لەگەڵ دایكو بابو هاوسەرو خێزانو دراوسێو خزمانو دۆستو برادەرو پەککەوتەو لێقەوماوو مسوڵمانانداکاریگەرترین دەوری هەیە لەپاککردنەوەو ئامادەبوونو شایستەبوونی نەفسدا بۆنزیكبوونەوەو بەرزبوونەوەو کامڵبوونو بەدیداری خوا شادبوون .

## ١٢ـ کەمخۆری و کەمخەوی و کەمدوێی و کەم تێکەڵی :

هەر لەکۆنەوە زانایانی خواناسی دڵبێدار فەرموویانە بابای ڕێبواری ڕێی خوا هەتا بەسەر چوار شتاندا زاڵ نەبێو نەیانخاتە ژێر ڕکێفی ئیرادەی خۆیەوە ، هیچی لێ چارەڕوان ناکرێ :

١ـ خواردنو خواردنەوە ( الأکل والشرب ) .

٢ـ نووستن ( النوم ) .

٣ـ قسەکردن ( الکلام ) .

٤ـ تێکەڵبوونی خەڵکی ( الأختلاط بالناس ) ،

چونکە ئەم چوارانە هەروەك چۆن چەند داخوازی‌یەکی بنەڕەتی‌ی ژیانن ، بنكو سەرچاوەی هەموو خراپەو تاوانەکانیشن .

بەڵێ مسوڵمانی خۆشەویست !

برسێتی‌و شەونخوونی‌و بێدەنگی‌و کەنارگیری ، چوار هۆو وەسیلەی هەرەگرنگو پێویستن بۆ هەرکەسێك کەبەمسوڵمانەتی‌و خواپەرستی‌یەکی سادەو عەوامانە قایل نەبێو خولیاو ئاواتی پێهەڵچوونو بەدیداری جوانی‌و هەیبەتی ( جمال وجلال ) ی خودا شادبوونی لەسەردا بێ .

ئنجا لەتێکڕای دەقەکانی قورئانو سوننەتیش دەفامرێتەوە کەهەرکام لەکەمخۆری‌و

---

(٢٣) لەکتێبی ( مسوڵمانی کامڵ ) دا هەرکام لە ( نوێژو ڕۆژوو وزیکرو قورئان خوێندنو حەجو جیهادو ماڵبەخشین ) تارادەیەك توێژراونەوە .

کەمخەویو کەمدوێییو کەمتێکەڵی شتی چاكو پەسندن ( ٢٤ ) .
ئەوەنده هەیە ڕەچاوكردنی خاڵێك مەرجو پێویستە :
١- نابێ کەمخۆریو کەمخەوییەکەی بگاتە ڕاددەیەکی وا کەبێهێزو لاوازو نەخۆشی بکات ، مەگەر لەچەند حاڵەتێکی زۆر پێویستدا بۆتەمبێ کردنو سەرشکاندنەوەی نەفس ، هەڵبەتە ئەودەمیش هەردەبێ بەئەندازەیەکی ماقووڵبێو کارێك نەکات زیانی لەقازانجی پتر بێت .

٢- نابێ کەمقسەییەکەی وای لێبکات کەلەئاقار ناهەقدا بێدەنگبێ یان مۆنو مرچو بێتام بێتە بەرچاوی خەڵکی ، بەڵکو کەمدوێییەکەی لەبواری گێڕانەوەی زماندا بێ لەقسەی خراپو ناپەسند .

٣- نابێ کەمتێکەڵییەکەی بەشێوەیەك بێ کەسەدان جۆرە ئیشو کاری خێرو چاکەی لەقیس بدات کەبەبێ تێکەڵبوونی خەڵکی ناکرێن ، وەك : لابردنی زوڵمو خراپەو بێشەرعیو چەسپاندنی بەرنامەی خوا ، یاریدەدانی لێقەوماوان ، سەردانی نەخۆش ، مردوو ناشتن ، بەشداریکردنی شینو شادی دۆستان . . . هتد .

---

( ٢٤ ) بڕوانە خودا دەربارەی کەمخۆری فەرموویەتی : ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلاتُسْرِفُوا إِنَّهُ لايُحِبُّ المُسْرِفِينَ ﴾ الأعراف ( ١٣ ) .
وەپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ﴿ مامَلأَ آدَمِيٌّ وِعاءً شَرًّا مِن بَطْنِهِ . . . ﴾ رواه الترمذی.
وەخودا لەمەدحی کەسانێدا کەلەشەوێدا بێدارنو سەرگەرمی ڕازونیازنو کەم دوخەون ، فەرموویەتی : ﴿ كانُوا قَليلاً مِنَ اللَّيلِ مايَهجَعُونَ ﴾ الذاريات ( ١٧ ) .
وەپێغەمبەرمان ﷺ دەربارەی کەمدوێیی فەرموویەتی : ﴿ . . . وَمن كانَ يُؤمِنُ بِاللهِ وَاليَومِ الآخِرِ فَليَقُل خَيرًا أو لِيَصمُت ﴾ رواه البخاری.
وەلەزۆر ئایەتو فەرموودان دەفامرێتەوە کەزۆر تێکەڵبوونی خەڵکی پەسند نییە ، بڕوانە خودا فەرموویەتی : ﴿ قَدْ أَفلَحَ المُؤمِنُونَ الَّذينَ هُم في صَلاتِهِم خاشِعُونَ . وَالَّذينَ هُم عَنِ اللَّغوِ مُعرِضُونَ ﴾ المؤمنون ( ١-٣ ) .
دەجا گومانی تێدا نیە ئەگەر بێتو بەس ئەم ئایەتەی ﴿ والذين هم عن اللغو معرضون ﴾ جێبەجێ بکەین ، خۆمان لەتێکەڵبوونی زۆربەی خەڵکیو بەشداربوونی زۆربەی کۆڕو مەجلیسەکانیان دەپارێزینو کەنار دەگرین ، چونکە مەگەر بەدەگمەن دەنا خەڵکی هەر سەرگەرمی قسەو بابەتی پووچو بێکەڵکن ! !

**تێبینی :**

لەڕاستیدا ئەم خاڵی دوازدەیەمە یەکجار گرنگو کاریگەرە لەبەرەو خوا چوونو پێهەڵاچوونی ڕێبواری ڕێی خودا ، کەواتە لەبەر کەمبایەخیٔ نەخراوەتە ئێرە ، بەڵکو لەبەر ئەوەبوو کەبابای ڕێبوار کاتێك دەتوانیٔ کەمخۆریو کەمخەویو کەمدوێییو کەم تێکەڵی بەسەر تێر خواردنو زۆرخەوتنو زۆر دووانو زۆر تێکەڵبووندا هەڵبژێریٔ ، کەبەهۆی نوێژکردنو ڕۆژووگرتنو زیکرو قورئان خوێندنو پاڕانەوەو بیرکردنەوەو . . هتدەوە تاڕادەیەك دڵی ڕووناك بووبێتەوەو ڕوحی بیٔهێزبووبیٔو ، حاڵەتێکی وای بۆ ڕەخسابیٔ کەتامو چێژ وەرگرتنی مەعنەوی بەسەر تامو چێژ وەرگرتنی ماددیدا زاڵبووبێت . بەواتایەکی دی : هەرچەندە ئەم مەسەلەی کەمخۆریو کەمخەویو کەمدوێییو کەمتێکەڵییە بەبەردی بناغەو بنچینەی دەروون پاككردنەوە ( تزکیە النفس ) و بەرزکردنەوە دادەنریٔ ، بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کەحاڵەتی ناوبراو ئەنجامو بەرهەمی ئەو شتانەی پێشەوەیە ، خستمانە دوای ئەوانەوە .

## ١٣- دۆستایەتیو هاوەڵایەتیکردنی ئینسانی صاڵح :

یەکی دیکە لەو هۆیانەی کەگەورەترین دەوریان هەیە لەیاریدەدانی ڕێبواری ڕێی بەرەو خوا چووندا ، بەتوێشوویکی یەکجار گرنگی ڕێی ناوبراو دادەنریٔ ، بریتیە لەنیزیکیکردنو برادەرایەتیگرتن لەگەڵ ئینسانی خواناسوپارێزگاردا ، هەربۆیەش پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەموویەتی : ﴿ المَرءُ علی دینِ خَلیلِهِ فَلیَنظر احَدُکُم مَن یُخالِل ﴾ (٢٥) .

دواپین دوعاو پاڕانەوەی ( یوسف ) یش علیه‌السلام ئاوایە : ﴿ . . أنتَ وَلِیّ فی الدُنیا وَالآخِرَةِ تَوَفَّنی مُسلِمًا وَألحِقنی بِالصَّالِحینَ ﴾ یوسف ( ١٠١ ) .

زانایانی پێشینمان خوا لێیان خۆشبیٔ سەبارەت بەگرنگیی برادەرایەتیکردنی ئینسانی چاك زۆریان فەرمووە ، بڕوێنە فەرموویانە : سەرنجبدە ! چۆن مانگ کەخۆی لەخۆیدا خڕۆکەیەکی تاریكو بیٔشەوقە ، لەبەرەکەتی برادەرایەتیکردنی ڕۆژدا چۆن لەفەیزو بەخششی بەهرەمەندبووەو بۆتە چراخان ! !

هەروەها فەرموویانە : ئەوەندە بەسە بۆ سەلماندنی گرنگی هاوەڵایەتی چاکان کەسەگی برادەرانی ئەشکەوت ( أصحاب الکهف ) کەلەماهیەتدا هیچ جیاوازیی لەگەڵ سەگەکانی دنیادا نیە ، بەهۆی نزیکی لەو گەنجە خواناسو مەردانەوە ، خوا لەگەورەترین کتێبی خۆیدا ناوی هێناوەو باسی دەوری ئێشکەگرتنی کردووە !

---

( ٢٥ ) رواه أبو داود والترمذی وحسنه والبیهقی.

بەڵێ هاوەڵایەتی چاکانو دۆستایەتیکردنیان هۆیەکی یەکجار کاریگەرو یاریدەدەرە بۆ بەرچاوڕوونیو ورەبەرزیو تیژبوونەوەو پشوودرێژی ڕێبوارانی ڕێی خواناسی، هەربۆیەش هەر لەدێرزەمانەوە خاوەن دڵانی بێدارو هۆشیار ئایەتی: ﴿ یاءَیُّها الَّذینَ إمَنُوا اتَّقوا اللّهَ وَکونُوا مَعَ الصّادِقین ﴾ یان کردۆتە شیعاری خۆیان!

بەڵام ئەوەی کەگرنگو پێویستە ئەوەیە کەلەتێگەیشتنی مەعناو مەبەستی (پارێزکاری) و (لەگەڵ ڕاستانبوون) دا بەهەڵەنەچین.

## ١٤- موتالاکردنو ئاشنابوون بەژیانو بەسەرهاتی صاڵحانو خواناسان:

هۆیەکی دیکە لەوانەی کەکاریگەرترین دەوریان هەیە لە (لەخوانزیکخستنەوە) ی ئینساندا، بریتییە لەموتالاو سەرنجدانی ژیانوگوزەرانی بەقیمەتی مەردانو شێرەژنانی ڕێی خواناسی.

بەڵێ . . . بەسەرهاتی (بۆخوا ژیاوان) بەئاسمانی بەرزی مێژووی خواناسییەوە بۆ باباى مسوڵمان، وەك ئەو ئەستێرە پڕشنگدارانە وان کەلەشەوی تاریكو تەڵەمدا بۆ بابای ڕێبوار دەبنە نیشانەو دەلیلو جێگەو ڕێگەی خۆیانیان پێدەدۆزنەوەو ڕێی لێتێکناچێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە وردو وریا بێو گوڵەئەستێرەو (٢٦) ئاورووچکە خۆی لێنەکەنە مانگو ڕۆژو ئەستێرەو بەدوای کڵاوی خوار نەکەوێو، لەتەڵەو داوی ئینسانی زرو ناڵەبارنەکەوێ!

ئنجا بۆسەلماندنی گرنگی شوێنپێهەڵگرتنی صاڵحان چەند دەقێکی قورئان بەنموونە دەهێنمەوە:

یەکەم: لەسوورەتی (الأنعام) دا خوای بەرزو مەزن پاش گێڕانەوەی بەشێك لەبەسەرهاتی (ابراهیم) علیه السلام، ناوی (١٧) کەسی لەپێغەمبەرانی پایەبەرز هێناوە کەئەمانەن:

(إسحاق، یعقوب، نوح، داود، سُلَیمان، أیُّوب، یوسُف، موسی، هارون، زَکَرِیّا، یَحیی، عیسی، إلیاس، إسماعیل، أَلیَسع، یونس، لوط) علیهم الصلاة والسلام، ئنجا پاش چەند ڕستەیەك فەرموویەتی: ﴿ أولئِكَ الّذینَ هَدی اللّهُ فَبِهُداهُم

---

(٢٦) گوڵەئەستێرە: جۆرە کرمێکی باڵداری ڕووناکبەخشی لاوازو کەم تەمەنە.

أقتَدِه . . ﴾ الأنعام ( ٩٠ ) ، واتە : ئەوانە کەسانێکن کەخودا ڕێڕوونی کردوون ، دەجا تۆش بەدوای ڕێبازی ڕوونی وان بکەوە . .

وەك دەبینین خوای میهرەبان ئامۆژگاری پێغەمبەری هەڵبژاردە دەکات ﷺ کەڕێوشوێنی بەرزی ئەو زاتانە ڕەچاوبکاتو بیانکاتە سەرمەشقی خۆی !

دووەم : لەسوورەتی ( هود ) یشدا پاش گێڕانەوەی بەسەرهاتی هەرکام لە ( نوح ، هود ، صالح ، إبراهیم ، لوط ، شُعَیب ، موسی ) دوای چەند ئایەتێك فەرموویەتی : ﴿ وَكُلًّا نَقُصُّ عَلَيْكَ مِن أنباءِ الرُّسلِ مانُثَبِّتُ بِهِ فُؤادَكَ . . ﴾ هود ( ١٢٠ ) ، واتە : وەلەهەواڵی هەرکام لەپێغەمبەران شتی وات بۆ دەگێڕینەوە کەدڵتی پێدەچەسپێنین . .

کەواتە ئاگاداربوونو شارەزابوون بەبەسەرهاتی خواناسان مایەی بڕوا یادبوونو باوەڕپتەوبوونو سەرەنجام دڵچەسپانو دامەزرانە !

سێیەم : هەروەها لەکۆتایی سوورەتی ( یوسف ) داو دوای گێڕانەوەی سەرگوزەشتەی ئەو زاتەبەرزە فەرموویەتی : ﴿ لَقَد كانَ في قَصَصِهِم عِبرَةٌ لِأُولي الألبابِ . . ﴾ یوسف ( ١١١ ) ، واتە : بێگومان لەبەسەرهاتیاندا پەند هەیە بۆخاوەن عەقڵان . .

کەواتە : مسوڵمانی خۆشەویستو بەڕێز !

کاتێکی چاك لەتەمەنت تەرخان بکە بۆخوێندنەوەو موتاڵای ژیانی خواناسان بەم شێوەیە :

١ـ پێغەمبەرانی خوا بەگشتی ( علیهم الصلاةوالسلام ) .

٢ـ پێنج پێغەمبەرە خاوەن عەزمەکان ( نوح ، إبراهیم ، موسی ، عیسی ، محمد ) بەتایبەتیو ، پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ بەتایبەتیتر .

٣ـ هاوەڵو شوێنکەوتووانی پێغەمبەران بەگشتی ، کەلەقورئانو سوننەتی ( صحیح ) دا بەسەرهاتەکانیان گێڕراونەوە ، وەك بەسەرهاتی ( مریم ) و ( أصحاب الكهف ) و ( طالوت ) و ( مؤمن آل فرعون ) و ( أصحاب القریة ) . . . هتد .

٤ـ هاوەڵانی پێغەمبەرمان ( رضي الله عنهم ) بەتایبەتیو ، چوار خەلیفە ڕاشیدەکان بەتایبەتیتر .

٥ـ زاناو خواناسو ناودارانی مێژووی ئیسلام هەر لەچاخی ( تابعین ) ەوە تائێستا وەك : حسن البصري ، إبن سیرین ، عمر ابن عبدالعزیز ، إبن المسیب ، سفیان الثوري ، زین العابدین ، إبراهیم ابن أدهم ، جعفر الصادق ، أبو حنیفة ، مالك ، شافعي ، أحمد بن حنبل ، حارث المحاسبي ، شیخ معروف

الكرخي، شيخ جنيد البغدادي، الغزالي، الجيلاني، العز بن عبد السلام، بهاءالدين نقشبند، جلال الدين الرومي، إبن تيمية، إبن قيم الجوزية، ألإمام الرباني، عبدالوهاب الشعراني، صلاح الدين الأيوبي، ولي الله الدهلوي، مولانا خالد، حسن البنّا، النورسي، المودودي، سيد قطب، محمد إقبال، دكتور علي شريعتي، خوالەهەموو لايەكيان خۆش بێ.

## ١٥- پابەندیی هووبەهووی بەڕێو شوێنی پێغەمبەرەوە ﷺ:

لەڕاستیدا ئەم مەسەلەیەمان لەبەر کەمئەمیەتی وەدوا نەخست، بەڵکو ویستمان قورئان فەرموودەنی ﴿ خِتَامُهُ مِسكٌ ﴾ بێو پارووی بەلەزەت بۆ دواوە بێ!

چونکە لەڕاستیدا مەسەلەی پابەندبوونی ئینسان بەسوننەتەکانی پێغەمبەرەوە لەهەموو حاڵێکدا گەورەترینو گرنگترینو کاریگەرترینو لەهەمان کاتیشدا قورسترین شتە لەژیانیدا، وەئەم مەسەلەیە هەموو ئەو مەسەلانەی کەلە (١٤) خاڵی ڕابردوودا خرانەڕوو دەنێوخۆ وەردەگرێ.

جامسوڵمانی سەنگین!

وەك ڕابەری بەڕێزمان ﷺ فەرموویەتی زۆر بەبایەخو گرنگی پێدانەوە پابەندی ڕێو شوێنی پێغەمبەر بەو، ددانی لەسەر ڕۆگرە ﴿ عَضّوا عَلَيها بِالنَواجِذ ﴾، چونکە هەموو ڕێ بەرەو لای خودا بەستراونو هیچ ڕێیەك ناتگەیەنێتە دیداری خودا بێجگە لەشوێنپێهەڵگرتنی پێغەمبەری نەخوێندەوار، ڕوحم بەفیدای بێ، ئەمەی کەگوتیشم قسەی گیرفانی خۆم نیەو دەقی قورئانە: ﴿ قُل إن كُنتُم تُحِبّونَ اللهَ فَاتَّبِعونِ يُحبِبكُمُ اللهُ وَيَغفِر لَكُم ذُنوبَكُم ... ﴾ آل عمران (٣١)، واتە: ئەی موحەممەد! بڵێ ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ وحەز لەدیداری دەکەن وەدوام بکەون جاخوداش خۆشی دەوێنو لەتاوانەکانیشتان دەبووری...

بەڵێ کێ دەیەوێ لەخوا بەنزیك بکەوێو بەدیداری شادبێ، باخەتو شوێنپێی پێغەمبەر بگرێو بەری نەدات، چونکە ئەو زاتە، ڕوحم فیدای بێت، دەلیلێکی کارامەو شارەزایەو چۆتە لای خوداو گەڕاویشەتەوە: ﴿ سُبحانَ الَّذي أسرى بِعَبدِهِ... ﴾ الإسراء (١).

کەواتە زۆر چاك دەزانێ بەکوێماندا بەرێو زۆرباش دەتوانێ ڕێگامان بۆ وەسفبکاتو سەر ڕاستو شارەزامان بکاتو مسۆگەر هەرکەسێك بەڕاستی دامێنی بگرێو خۆی تەسلیم بکات، ڕێی لێ ون نابێو بەمەنزڵی دەگەیەنێ، خوداش فەرمەیەتی: ﴿ لَقَد كانَ لَكُم في رَسولِ اللهِ أُسوَةٌ حَسَنَةٌ... ﴾ الأحزاب (٢١).

کەوابێ مسوڵمانی شیرین !

هەوڵبدە پێغەمبەری پێشەواو ڕەندو ئاکار پەسندت ، خواردنو خواردنەوەی ، نووستنی ، قسەکردنی ، هەستانی ، دانیشتنی ، ڕۆیشتنی ، چاکو چۆنیی ، بەرگو پۆشاکی ، نوێژکردنی ، ڕۆژووگرتنی ، جیهادکردنی ، تووڕەبوونی ، لێبووردنی . . . هتدچۆن بووە ، تۆش وابە ، چونکە بارتەقای ئەوەی کەوەك وی دەچی بەلای وی دەچی ! ! (٢٧) بەڵێ مسوڵمانی بەڕێزو سەنگین ! شوێنپێهەڵگرتنی پێغەمبەر ﷺ چاکترینو کاریگەرترین هۆی بەرەو خوا چوونو لەخوا نزیکبوونەوەیە ، هەربۆیەش خوای میهرەبان لەفەرموودەیەکی قودسیدا فەرموویەتی: ﴿ وَما تَقَرَّبَ إليَّ عَبدي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إليَّ مِمّا افتَرَضتُ عَلَيهِ ، وَمايَزالُ عَبدي يَتَقَرَّبُ إليَّ بِالنَّوافِلِ حتّى أُحِبَّهُ فَإذا أحبَبتُهُ كُنتُ سَمعَهُ الّذي يَسمَعُ بِهِ وَبَصَرَهُ الّذي يُبصِرُ بِهِ وَيَدَهُ الّذي يَبطِشُ بِها وَرِجلَهُ الّذي يَمشي بِها ، وَإن سَألَني أعطَيتُهُ وَلَئِن استَعاذَني لَأُعيذَنَّهُ ﴾ (٢٨) ، واتە : . . . وەبەندەی من بەهیچ شتێك لەمن وەنزیك ناكەوێ كەخۆشەویستتر بێ لەلام لەوەی لەسەرم پێویست كردووە ، وەبەندەی من بەردەوام بەهۆی سوننەتانەوە لێم نزیك دەبێتەوە هەتا خۆشم دەوێ ، جائەگەر خۆشم ویست دەبمە ئەو گوێیەی كەپێی دەبیستێو ، ئەو چاوەی كەپێی دەبینێو ، ئەو دەستەی كەپێی دەگرێو ، ئەو لاقەی كەپێی دەڕوات ، وەئەگەر داوای شتێكم لێبكات دەیدەمێ ، وەئەگەر پەنام پێبێنێ پەنای دەدەم ! !

لەم فەرموودە بەرزو پیرۆزە چەند شتێك وەردەگیرێن :

١- مرۆڤ لەهەموو شتێك زیاتربەهۆی بەجێهێنانی فەرزەكانەوە لەخوا نزیك دەبێتەوە ، كەواتە پێویستە ئەوپەڕی گرنگیو بایەخ بەبەجێهێنانو پاراستنی فەرزەكان بداتو هەتا شتێكی فەرز لەوێبێ خۆی بەسوننەتانەوە خەریك نەكات ، چونكە ئەگەر لەسووری تێی دۆڕاند لەلابای بۆی تێهەڵنایەتەوە .

٢- هەركەسێك فەرزەكان بەتەواوی جێبەجێبكات دەم بۆ دەمێ پتر بەهۆی سوننەتانەوە لەخوا نزیك دەبێتەوەو دەیناسێو پێی ئاشنادەبێ ، كەواتە شوێنپێهەڵگرتنی

---

(٢٧) چاکترین سەرچاوە کەمن لێی بەهرەمەند بروبم بۆ شارەزابوون بەخوو ڕەوشتو حاڵو باڵو وردو درشتی پێغەمبەری مەزن ﷺ ، كتێبی ( الشفا ) یە كە ( قاضی عیاض ) نووسیویەتیو لەچوار بەرگان دایەو ( ملا علی قاری ) و ( خفاجی ) شەرحیان كردووە .

(٢٨) رواه البخاری.

پێغەمبەرمان ﷺ چاکترین هۆی خواناسینو بڕوا پتەوبوونو بەرەو خواچوونە !

٣ـ لەسۆنگەی ئەوەوە کە ( محمد ) ﷺ چاکترینو خۆشەویستترین بەندەی خوایە ، مرۆڤ بەهۆی پابەندی مووبەمووی بەسوننەتەکانییەوە دەبێتە خۆشەویستی خوداو ، هەتا ڕادەی پابەندییەکەی پتربێ ، ئەندازەی خۆشەویستییەکەشی پتر دەبێ .

٤ـ کاتێك بەندە هێندە بەسوننەتەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ پابەندبوو کەببێتە خۆشەویستی خودا ، وای لێدێ دەبێتە دۆست ( ولی ) ی خوداو ، ئەوکاتەش چاوو گوێو دەستو پێو باقی ئەندامە پەنهانو ڕواڵەتەکانی بەس بەفەرمانی خوداو بەپێی ڕەزامەندی وی دەجووڵێنو ، هەموو دەمێ لەخزمەتی خوادا دەبێو هەرکاتێکیش پەنای بۆ بەرێ پەنای دەداتو دەیپارێزێ .

مسوڵمانی عەزیز !

ئێستاش کەزۆر بەکورتیو ڕاپازنەراوی لە ( ١٥ ) خاڵاندا وەڵامی پرسیاری ( بەچی بەرەو خوا بچینو پێیهەڵاچین ) مان دایەوە ، چەند ئاگادارییەکی گرنگ دەخەینە ڕوو وکۆتایی بەباسی ( ڕێگای صاڵحبوونو بەرەو خوا چوون ) دێنین :

• • •

# چەند ئاگاداری‌یەکی گرنگ

**یەکەم:**

دڵی ساغ ( قلب سليم ) تاکە دەستمایەیە کەلەڕۆژی دوایی‌دا دەفریا ئینسان دێتو دەبێتە هۆی لەدۆزەخ قوتاربوونیو بەبەهەشت شادبوونی، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ يَومَ لايَنفَعُ مالٌ وَلابَنونَ إلاّ مَن أتى اللهَ بِقَلبٍ سَليم ﴾ الشعراء (٨٨ـ٨٩) .
جابێگومان دڵی ساغ نیشانەی زۆرن، کەواتە بۆئەوەی هەرکامێکمان تاڕادەیەك ئاگاداری ساغیو نەساغی دڵمان بین، باچەند درووشمو نیشانەیەکی دڵی ساغ بخەینەڕوو ئەگەرچی بەکورتیش بێ:

١ـ تامو چێژ وەرگرتن لەنوێژو ڕۆژوو وزیکرو قورئان خوێندنو پاڕانەوەو . . . هتد .
٢ـ هەست کردن بەتاڵیو ناخۆشی هەر گوناحو خراپەیەك هەرچەندە گچکەش بێ .
٣ـ نیشانەیەکی دیکەی دڵی ساغ ئەوەیە کەئینسان بەگشتی تەنیایی پێ‌خۆشتر بێت لەتێکەڵبوونی خەڵکی، مەگەر لەکاتی ئەنجامدانی ئەو ئەرکو کارە خێرانەدا کەپەکیان لەسەر تێکەڵبوونی خەڵکی کەوتووە .
٤ـ پاکیی دڵ لەبوغزو غەرەزو ئێرەیی ( حسد ) و بەسووك سەیرکردنی خەڵکی .
٥ـ بەزەییو پەرۆشو دڵپێ‌سووتان سەبارەت بەو کەسانەی کەئازاری دەدەنو خراپەی لەگەڵدا دەکەن، وەدوعا بۆکردنیانو، داوای شیفاو چاکبوونەوە بۆ لەخوا کردنیان .

ئەمانە پێنج نیشانەو بەڵگەی بنچینەییو بەرچاوی دڵی ساغو سەلیمن، خوا بەقسمەتمان بکاتو لەفەیزو بەخششی خۆی بۆمان زیادبکات .

**دووەم:**

ئینسان ئەگەربیەوێ بەرەو خواناسینو بەدیدار شادبوونی ( لقاء الله ) ڕێ‌بگرێتەبەر، نابێ جگە لەناسینی خواو پەی‌بردن بەسیفەتە بەرزو پەسندەکانیو لێ‌نزیکبوونەوەیو ئەو شتانەی کەپاشکۆی ئەوانەن وەك چوونە بەهەشتو چەپاڵەدران لەدۆزەخ هیچ نیازو مەبەستێکی دیکەی

هەبێت ، تەنانەت نابێ مەبەستی لەوبەرەو خوا چوونە ( بووژاندنەوەی ئیسلام ) یش بێت !

چونکە نەفسو شەیتان لەپەنای ئەم جۆرە مەبەستو ئامانجە بەرزو پاکانەدا ، گەراو توخمی دەیان جۆرە تەخۆشی پیسو کوشندە دادەنێن .

**سێیەم :**

بۆ قبووڵبوونو وەرگیرانی هەرکارێکی خێروچاکە سێ مەرج پێویستن :

١- ڕیاتێدانەبوون ( عدم وجود الرياء ) .

٢- هەستنەکردن بەخۆپەسندی ( عدم الإحساس بالعجب ) .

٣- دووربوون لەداهێنان ( الإبتعاد عن البدعة ) لەبواری عیبادەتدا .

بەڵێ . . خواپێمەبەستبوون ( الإخلاص ) و بەشانو شەوکەتیخۆ نەنازینو هەموو شتێك لەتۆفیقو یارمەتی خوا زانین ، وەشوێنپێهەڵگرتن ( إتباع ) ی شەرع ، سێ مەرجی بنەڕەتین بۆ وەرگیرانی هەرکارێکی چاکو ، بەنەبوونی هەرکامێکیان ئینسان ڕەنج بەخەسار دەبێو دەبێتە سەپانی پروشێ . بەواتایەکی دیکە : ( ریاء ) و ( عجب ) و ( إبتداع ) سێ کرمو میکرۆبی پیسن ، هەرکامێکیان۔ چجای هەرسێکیان۔ بکەوێتە هەرکارێکی خێرەوە ، وەك شیرێ هەڵگەڕاوو گەنمی سنو کوێرروو لێدراوی لیدێت .

**چوارەم :**

هەرکاتێك ویستت بزانی داخوا لەلای خوای پەروەردگار چۆنی ؟ ڕامێنە بزانە ئەو لەلای تۆ چۆنە ، چونکە ئەو لەلای تۆ چۆنبێ ، تۆش لەلای وی ئاوای !

کەوابێ :

١- تۆ چەندەت خوا لەلا بەقەدرە ، ئەویش هێندە قەدرت دەگرێ !

٢- تۆ چەندەت ئەو خۆشدەوێ ، ئەویش هێندە !

٣- تۆ چەندە بەتەنگ ڕەزامەندی ویەوەبی ، ئەویش هێندە !

٤- تۆ چەندە خێرایی دەکەی لەجێبەجێکردنی فەرمانەکانی خودا ، ئەویش هێندە لوتف دەنوێنێ لەوەڵامدانەوەی داوایەکانت !

٥- تۆ چەندت ئەو لەیادە ئەویش هێندە : ﴿ فَاذكُروني أذكُركُم ﴾ .

٦- تۆ چەندە لەسەر وی توورە دەبی ئەویش هێندە : ﴿ إن تَنصُروا اللهَ يَنصُركُم . . ﴾ .

٧- تۆ چەندە عادەتی خۆت بۆ وی تێكدەدەی ئەویش هێندە ( خرق العادة ) ت بۆ

دەکات ، سەرنجبدە چۆن عادەتی سووتاندن ( إحراق ) ی لەئاگردا نەهێشت بۆ ( إبراهیم الخلیل ) ! !

٨- تۆ چەندە پشتی پێببەستیو تێیرا ببینی ، ئەویش هێندە پشتت دەگرێو بەدەنگتەوە دێ !

٩- تۆ چەندە چاکەی لێ چاوەڕوان بکەی ، ئەویش هێندەت چاکە لەگەڵ دەکات !

ئەمانەش هەمووی لەڕستەی : ﴿ أنا عِندَ ظَنِ عَبدي ﴾ دەفامرێنەوە ، کەبوخاری گێڕاویەتەوە .

بەڵام دووشت لەبیر نەچن :

١- چەندە خوا بناسی ئەوەندەش لێی دەترسیو خۆشت دەوێو گومانت بەرامبەری چاك دەبێت ، چەندەش خۆشت بوێو لێی بترسیو گومانی چاکی پێبەری ، ئەوەندەش بەندایەتی بۆ دەکەی ، وەك ڕابەرمان ﷺ فەرموویەتی : ﴿ لَو أحسَنوا الظَنَ لأحَسّوا العملَ ﴾ (٢٩) .

٢- ( چەندە ) ی تۆو ( ئەوەندە ) ی وی یەکسان نینو پێکەوە ناخرێنە تەرازوێکەوە ، بەڵکو ( چەندە ) ی تۆلەقەدەر خۆتەو ( ئەوەندە ) ی ویش لەقەدەر وی ! هەربۆیەش خوا لەفەرموودەی قودسیدا فەرموویەتی : ﴿ وَإذا أقبَلَ إليَّ يَمشي أقبَلتُ إليهِ أهرِولُ ﴾ (٣٠)

## پێنجەم :

ڕێی بەرەو خوا چوون کۆتایی نیە ، چونکە خودا بێسنوورە ، دیارە دەریای ناسینیشی بێسنوورە ، وە ( کامڵبوون ) ی مرۆڤ شتێکی گوێرەیی ( نسبي ) یە ، دەنا ئینسان قەت بەتەواوی لەدنیادا ( کامڵ ) نابێ ، چونکە ئەگەر وابێ جموجۆڵو بەرەو خواچوونی کۆتایی پێدێو ڕادەوەستێ ! !

• • •

## شەشەم :

هەرکەسێك دەیەوێ زیاتر بەدەریای بێبنی تەصووفو عیرفاندا بچێتە خوار ، باسەرنجی ئەم سەرچاوانە بدات ، بەڵام ئاگاداری خڵتەو خاڵیش بێ ، بەتایبەتی سەبارەت بەیەکەمیان کەگرنگترینیشیانە :

---

( ٢٩ ) رواه مسلم .

( ٣٠ ) متفق عليه .

١ـإحياء علوم الدين ـغزالي .
٢ـإيقاظ الهمم في شرح الحِكَم ـابن عجيبة .
٣ـالفتوحات الإلهيّة شرح المباحث الأصلية ـابن عجيبة .
٤ـمَدارجُ السّالِكين ـابن قيم .
٥ـمذكرات في منازل الصديقين والربّانيين ـسعيد حوى .
٦ـكيمياى سعادت ـغزالي .
٧ـمكتوبات الإمام الربّاني .
٨ـالفتح الربّاني ـالشيخ عبدالقادر الجيلاني .

## لەکۆتاییدا

ڕەنگە یەکێك بپرسێ باشە ئەو ڕێیە شەش قۆناغییەی کەتۆ ناوت لێناوە ( ڕێگای صاڵحبوونو بەرەو خواچوون ) ، سەربەکام لەڕێباز ( طريقة ) ەکانی ( تصوف ) ەو ئەگەر لەڕێبازە ناسراوەکانی سۆفیایەتیش جوێیە ناوی چییە ؟

ئێمە ڕێزو حورمەتی زۆرمان بۆ هەموو ئەو ڕێبازە ڕاستو ( ٣١ ) ساغانەی ( تصوف ) هەیە کەخەڵکێکی زۆریان بەرەو خوا گێڕاوەتەوەو ژمارەیەکیشیان لێ بەخودا گەیاندوونو ئیسلامێکی ڕاستو ساغیان تێگەیاندوون ، بەڵام ئەوەی ئێمە لێرەدا بەڕێگای صاڵحبوونو بەرەو خوا چوونمان داناوە ، ناوێکی تایبەتی نیەو ، ڕاستەوخۆ لەقورئانوسوننەتو تەجرەبەی ڕاستو ساغی خواناسان وەرگیراوە ، ئەگەر بگونجێ هیچ ناویشی لێبنرێن دەڵێین : « ڕێبازی قورئانو سوننەت » ، خۆئەگەر بشتەوێ پاڵبدرێتە لای کەسێك ئەوە « ڕێبازی موحەممەدی » یە .



---

( ٣١ ) بەڵێ . . ئێمە ڕێزمان بۆ ڕێبازە ڕاستو ساغەکانی ( تصوف ) هەیە ، بەڵام بەداخەوە لەمێژە ( تصوف ) ی ڕاستەقینە مەگەر بەدەگمەن دەنا بێسەرو سۆراغەو ، زۆر ڕێچکەی خوارو خێچو پڕ بیدعەتو ئەفسانەش بەناوی ( تصوف ) ەوە هاتوونە گۆڕێ کەلەجیاتی تەقواو دینداریو صەفای دڵو . . . هتد ، هەر چڵکو چەپەرو قوڕاوی سەرکێشیو دینداریو ژەنگی دەروونییان لێدەچۆڕێ .

# پاشكۆ

١- ئایا قۆناغەكانی ڕێگای صالحبوونو بەرەوخواچوون هەر ئەم شەشەن ؟

٢- حیكمەتی ڕیزكرانی ئەم شەش قۆناغە بەم شێوەیە چی‌یە ؟

٣- مەبەست لەبڕینی قۆناغەكان بەجێ‌هێشتنیان نی‌یە .

٤- دە ( ١٠ ) یاسا دەربارەی پەرێزی چاكەو خراپە لەژیانی مرۆڤدا .

٥- دە ( ١٠ ) وەسیلە لەپێداویستی‌یەكان ( مستلزمات ) ی ڕێی بەرەو خواچوون .

٦- دە ( ١٠ ) پایەو بنچینەی گرنگی ڕێی بەرەو خواچوون .

٧- ناوە چاكەكانی خوا چاكترین وەسیلەی صالحبوونو بەرەو خواچوونن .

٨- دەروولێكرانەوە بەرهەمی بەردەوامبوونە لەسەر داوای لێبوردن‌كردن .

٩- بەرچو كۆسپەكانی سەر ڕێی بەرەو خواچوون .

- خراپ حاڵی‌بوون لەئیسلام
- گوناحە ڕواڵەتی‌یەكان
- گوناحە دەروونی‌یەكان
- زیاد لەپێویست گرنگی‌دان بەژیانی دنیا
- شوێن‌كەوتن‌ولاساكردنەوەی كوێرانەی پێشینانو دەوروبەر
- بێ مامۆستایی‌و چاوساغی
- بێ ئاگایی ( الغفلة )
- شەیتان

## یەکەم :

## ئایا قۆناغەکانی ڕێگای صاڵحبوونو بەرەو خوا چوون هەر ئەم شەشەن ؟

لەوەڵامدا دەڵێین :

نەخێر ، بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کەزاناو شارەزایانی لایەنی پەروەردەو عیـرفانو تەصەووف ، لەنێو خۆیاندا دەربارەی پلەو قۆناغەکانی ڕێگای ناوبراو لەسەر ژمارەیەکی دیاریکراو ڕێكنەکەوتوونو (٣٢) ، لەچۆنیەتی ڕیزکردنو ژمارەی قۆناغو مەنزڵەکانی چاکبوونو بەرەو خواچووندا بیروڕای جیاجیایان هەن ، کەلەنێوەڕۆکدا یەك دەگرنەوە ، منیش پاش وردبوونەوەوتێوەڕامانی زۆرو بەتەجرەبەی کردەیی خۆشم بۆم دەرکەوت کەهەموو پلەو قۆناغەکانی ڕێگای صاڵحبوونو بەرەو خوا چوون لەم شەش قۆناغەدا کورت دەبنەوە ، جابەمەبەستی ئاسانکردنی لێحاڵیبوونی مەبەستو زیاتر ڕوونکردنەوەی بابەتەکە ، ڕێگای ناوبراوم دابەشکرد بۆ شەش قۆناغی گۆڕین ، واتە ( تۆبەکردنو پاکبوونەوە ، زانیاریو چاوڕوونبوونەوە ، ئیخلاصو یەکلابوونەوە ، پارێزکاریو وردبوونەوە ، ئیحسانو بەرزبوونەوە ، دەوامو ساردنەبوونەوە ) کەلەڕاستیدا هەموو پلەو قۆناغەکانی دیکەی ئەو ڕێگا بەرزوپیرۆزە دەنێو خۆیان دەگرن .

## دووەم :

## حیکمەتی ڕیزکرانی ئەم شەش قۆناغە بەم شێوەیە چیە ؟

حیکمەتو هۆی ڕیزکرانی ئەو شەش قۆناغانە ، کەشەش قۆناغی سەرەکیو بنەڕەتی ڕێگای

---

(٣٢) ابن قيم الجوزية ڕەحمەتی خوای لێبێ کەچاکترینو وەفادارترین قوتابی مامۆستای زاناو خواناسو شۆڕشگێڕ ( ابن تيميه ) یە ، لەکتێبی ( مدارج السالكين شرح منازل السائرين ) دا کەبەبڕوای من پوختترین کتێبی ( تصوف ) ی ڕاستەقینەی پابەند بەقورئانو سوننەتە ، لەوبارەوە فەرموویەتی : «وقد أكثر الناس في صفة المنازل وعددها ، فمنهم من جعلها ألفا ومنهم من جعلها مائة ، ومنهم من زاد ونقص ، فكل وصفها بحسب سيره وسلوكه . . » بڕوانە : مدارج السالكين ، ب١ ، ل١٢٢ .

چاكبوونو بەرەو خوا چوونن بەو شێوەیەی كەلەم ئاڵقەیەدا دەبینددرێ ، ئەوەیە كەئینسانی مسوڵمانو ڕێبواری ڕێی بەخۆداهاتنەوەو بەرەو خواگەڕانەوە ، دوای ئەوەی بەلوتفو بەزەیی خوا لەخەوی شوومی لاڕێبوونو لەخوادووربوون بێدار دەبێتەوە ، دەروونو ویژدانی پاڵی پێوە دەنێو هانی دەدات كەبەرەو خوا بگەڕێتەوەو بەخۆیدا بێتەوە ، بەڵام كەتەماشا دەكات بەپێڵاوی پیسی تاوانو خراپەو بێئاگاییەوە ڕێگای نادرێ بچێتە نێو میحرابی خواپەرستیو بەرەو خوا چوونەوە ، بڕیار دەدات كەبەئاوی پەشێمانیو گەڕانەوەیەكی ڕاستو ساغ پاك پاك خۆی بشوات ، بەم شێوەیە یەكەمین پلەو قۆناغی ڕێگای خۆچاككردنو بەرەو خواسەفەركردن هەڵدەبوێرێ .

ئنجا دوایی كەخۆی پاك دەكاتەوەو بۆ وەڕێكەوتن خۆی سازدەكات ، تەماشا دەكات ڕێگای ناوبراو ڕێیەكی سەختو دژوارو پڕ كەندو لەندو هەورازو نشێوەو دەیان جۆرە جەردەو ڕێگری لەسەر دانیشتوونو خۆیان تێدا لەبۆسە ناوە ، بۆیە سەرەنجام دەگاتە ئەو قەناعەتەی كەپێویستە بەرلەوەی وەڕێبكەوێ قۆناغی ( زانیاریو چاو ڕوونبوونەوە ) ش ببڕێ نەك كوێرانە ملی ڕێیە بگرێو بەپێخواسی وەنێو بكەوێ .

ئنجا دوای ئەوەی تاراددەیەك دەربارەی ڕێگای گۆڕین شارەزا دەبێ ، جارێكی دیكە هەڵوەستەیەك دوكاتو چاوێك بەدەروونی خۆیدا دەگێڕێتەوەو ڕووی دڵی لەگەڵ قیبلەی ( بەس خوا پێمەبەستبوون ) دا ڕاست دەكاتو بەقۆناغی ( ئیخلاصو یەكلابوونەوە ) شدا تێدەپەڕێ .

ئنجا پاش تەواوكردنی پلەو قۆناغەكانی ( پەشیمانبوونەوەو چاو ڕوونبوونەوەو یەكلابوونەوە ) ، كەهەرسێكیان وەك بنچینەو بناغەی كۆشكی بەرزی بەرەو خواچوون وان ، بێجگە لەدیوار دانان چیدی نامێنێ ، ئیدی ئەوجار بابای ڕێبوار لەگەرمەی بڕینی قۆناغی درێژو گرنگی ( پارێزگاریو وردبوونەوە ) دا دەست بەكار دەبێ .

پاش پێڕۆچوون ( رسوخ القدم ) یش بەقۆناغی ناوبراودا ڕێبوار ( سالك ) ی ڕێی صاڵحبوونو بەرەو خواچوون جگە لەبەرزبوونەوەو پێهەڵاچوون بەپەیژەی قۆناغی ( ئیحسانو بەرزبوونەوە ) دا هیچ كارێكی دیكەی نامێنێ .

ئنجا دوای ئەوەی ئینسان كەوتە نێو قۆناغو پلەی ( ئیحسان ) ەوە ، كەبەرزترین پلەی خواناسینو دوایین قۆناغو مەنزڵی صاڵحبوونو بەرەو خواچوونە ، هەر ئەوەندەی دەمێنێ كەدەست بگەیەنێتە پلەو قۆناغی ( دەوامو ساردنەبوونەوە ) و لەسەر بڕینو تەواوكردنی ئەو ڕێگا بەرزو پیرۆزە پشوو درێژو بەردەوامبێو بەرەو دوا نەگەڕێتەوە .

## سێیەم :

## مەبەست لەبڕینی قۆناغەکان بەجێهێشتنیان نیە

بەڵێ مەبەست لەبڕینو هەڵبواردنی ئەو شەش قۆناغەوهەموو قۆناغەکانی دیکەی ڕێگای بەرەو خواچوون ( طريق السير إلى الله ) بەجێهێشتنی ئەو قۆناغانە نیە ، بۆ وێنە کەدەڵێین : بابای ڕێبوار قۆناغی تۆبەکردنو پاکبوونەوەی تەواوکرد ، مەبەست ئەوە نیە کەقۆناغی ناوبراوی بڕیوەو بەجێی هێشتوەو لێی تێپەڕیوە ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کەلەو قۆناغەدازەقترینو بەرچاوترین حاڵەتی بابای ڕێبوار تۆبەکردنو داوای لێبووردنو پەشیمانبوونەوەو خۆپاککردنەوەیە ، دەنا قۆناغی ناوبراو وەك حاڵەتێکی دەروونیو خەسڵەتێکی بنچینەیی لەهەموو قۆناغەکانی دیکەش هەر بەردەوامە ، هەروەها قۆناغەکانی دیکەش بەهەمان شێوە ، چونکە ئەگەر وانەبێ دەبێ بڵێین : ئەو ئینسانەی کەدەچێتە قۆناغی ( زانیاریو چاوڕوونبوونەوە ) وە ، دەبێ حاڵەتی گەڕاوەیی ( تائب ) ی نەمابێو ، ئەو کەسەی لەقۆناغی ( ئیخلاصو یەکلابوونەوە ) دایە ، دەبێ خەسڵەتی زاناییو چاوڕوونی نەمابێو ، ئەوەی کەلەقۆناغی ( پارێزکاری ) دایە دەبێ حاڵەتی ئیخلاصی فەوتابێ ! !

دیارە ئەمەش شتێکی مەحاڵەو پێچەوانەی واقیعیشە ، کەواتە وەك گوتمان مەبەست لەبڕینی ئەو پلەو قۆناغانە بەجێهێشتنو واز لێهێنانیان نیەو ، مەبەست ئەوەیە کەپێشتر ڕوونمان کردەوە (٣٣) .

## چوارەم :

## دە ( ١٠ ) یاسا دەربارەی پەیڕیزی چاکەو خراپە لەژیانی مرۆڤدا

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لەخۆیو بابی ڕازی بێ سەبارەت بەتەئسیری چاکەو خراپە

---

( ٣٣ ) لەکتێبی ( یادی خودا ) لەبەرگی یەکەمیدا ، ئەو مەسەلەیە بەدرێژی توێژراوەتەوە .

لەژیانی ئینساندا فەرموویەتی: ﴿ إن للحسنة ضياء في الوجه ، ونورا في القلب ، وقوة في البدن ، وسعة في الرزق ، ومحبة في قلوب الخلق ، وإن للسيئة سوادا في الوجه ، وظلمة في القلب ، ووهنا في البدن ، ونقصا في الرزق ، وبغضة في قلوب الخلق ﴾ (٣٤) .

ئەم قسەیە بەپێزەی ( ابن عباس ) کەبەئاشکرا ڕووناکی بنەماڵەی پێغەمبەرایەتی پێوە دیارە ، دە ( ١٠ ) یاسای گرنگی دەربارەی تەئسیرو شوێنەواری چاکەکردنو خراپەکردنی لەژیانی ئینساندا تێدان ، پێنجیان پەیوەندی‌یان بەبەرهەمی چاکی چاکەکردنەوە هەیە کەئەمانەن:

١ـ گەشیو درەوشانەوەی ڕوو ، خوداش فەرموویەتی: ﴿ سِيماهُم في وجُهِهِم من أثَرِ السُّجودِ . . . ﴾ الفتح (٢٩) .

٢ـ ڕووناکی دڵ ، خوداش فەرموویەتی: ﴿ أفَمَن شرَحَ اللهُ صَدرَهُ لِلإسلام فَهُوَ على نورٍ من رَبِّهِ . . . ﴾ الزمر (٢٢)

٣ـ بەهێزی جەستە ، خواش لەسەر زمانی ( هود ) عليه السلام فەرموویەتی: ﴿ وَياقَومِ استَغفِروا رَبَّكُم ثُمَ تُوبوا إلَيهِ يُرسِلِ السَّماءَ عَلَيكُم مِدرارًا وَيَزِدكُم قُوَّةً إلى قُوَتِكُم . . . ﴾ هود (٥٢) .

٤ـ فراوانی بژێوو ڕۆزی ، خواش فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَتَّقِ اللهَ يَجعَل لَهِ مَخرَجًا وَيَرزُقهُ مِن حَيثُ لايَحتَسِبُ ﴾ الطلاق (٢ـ٣) .

٥ـ خۆشەویستی لەدڵی خەڵکی ـ مسوڵمان ـ دا ، خوداش فەرموویەتی: ﴿ إنَ الذينَ آمَنوا وَعَمِلوا الصّالِحاتِ سَيَجعَلُ لَهُمُ الرَّحمنُ وُدًّا ﴾ مريم (٩٦) .

وەپێنجیشیان باسی پەرێزی شوومی خراپەکردن دەکەن کەئەمانەن:

٦ـ ڕەشیو تاڵخی‌ی دەموچاو ، خواش فەرموویەتی: ﴿ . . . وَأمّاالَّذينَ اسوَدَّت وُجوهُهُم أكَفَرتُم بَعدَ إيمانِكُم . . . ﴾ آل‌عمران (١٠٦) .

٧ـ تاریکی‌ی دڵو دەروون ، خوداش فەرموویەتی: ﴿ اللَّهُ يَستَهزِئُ بِهِم وَيَمُدُّهُم في طُغيانِهِم يَعمَهونَ ﴾ البقرة (١٥) .

٨ـ بێـ هێزی‌ی لەش .

٩ـ کەمو کورتی بژێو ، خوداش فەرموویەتی: ﴿ وَمَن أعرَضَ عَن ذِكري فَإنَّ لَهُ مَعيشَةً ضَنكًا . . . ﴾ طه (١٢٤) .

١٠ـ بوغزێنراوی لەدڵی خەڵکی ـ مسوڵمان ـ دا ، خوداش فەرموویەتی: ﴿ مُحَمَّدٌ رَسولُ اللَّهِ وَالَّذينَ آمَنوا مَعَهُ اشِدّاءُ على الكُفّارِ . . . ﴾ الفتح (٢٩) .

---

(٣٤) ئەم قسەیە ( ابن القيم الجوزية ) لە ( الوابل الصيب من الكلم الطيب ) دا گێڕاویەتەوەو ، لەگەڵێك شوێنی دیکەشدا باسکراوە .

## پێنجەم :

# دە (١٠) وەسیلە لە پێداویستی یەکان (مستلزمات) ی ڕێی بەرەو خواچوون

خوێنەری خۆشەویست !

شتێکی ئاشکراو بێ پێچ و پەنایە کەخوای پەروەردگار ئەم ژیانەی ئێمەو تێکڕای بوونەوەریشی بەپێی یاسای هۆکاری (قانون السببية) دامەزراندووەو بەڕێوەی دەبات. کەواتە بۆ هەرکارێك سازکردن و دابین کردنی ئەو هۆیانە پێویستە کەپەکی لەسەریان کەوتووەو بەبێ وان نایەتەدی.

ئنجا مەسەلەی صاڵحبوون و بەرەو خواچوونیش کەگرنگ ترین و بەرزترین کارە، وەك هەموو ئیش و کارێکی دیکە حەوجێی چەند وەسیلەو هۆیەکی تایبەتی یە، کەبەبێ وان ئەنجامدران و بەڕێوەبرانی مەحالە. جاپێغەمبەری پێشەواو چاوساغمان ﷺ لەیەکێ لەفەرموودە بەپێزەکانیدا، دە (١٠) وەسیلەی گرنگ و بنچینەیی بۆ دەست نیشان کردووین و فێری کردووین کەلەکاتی پاڕانەوەماندا لەخوای میهرەبانیان داوا بکەین، فەرموودەکەش ئەمەیە: ﴿ اللَّهُمَّ إنّي أسألُكَ الثَّباتَ في الأمرِ، وَالعَزيمةَ على الرشدِ، وَأسألُكَ شكرَ نعمَتكَ، وَحُسنَ عِبادَتكَ، وَأسألُكَ قلبًا سَليمًا، وَلسانًا صادقًا، وَخُلقًا مُستقيمًا، وَأسألُكَ مِنَ خيرِ ماتعلَمُ، وَأعوذُ بِكَ مِن شرِّ ماتعلَمُ، وَأستغفِرُكَ لِماتعلَمُ ﴾ (٣٥).

ئەی خوایە ! من داوای چەسپاوی لەکاردا و، دڵدامەزراوی لەسەر هەقت لێ دەکەم، وەداوات لێ دەکەم سوپاسی چاکەت بکەم و چاکت بپەرستم، وەدڵێکی ساغ و زمانێکی ڕاست و ڕەوشتێکی چاکت لێ داوادەکەم، وەداوای هەرچاکەیەکت لێ دەکەم کەبۆخۆت دەیزانی، وەپەنات دێنمەبەر لەهەر خراپەیەك کەپێی زانای، وەداوای لێبووردنت لێ دەکەم بۆ هەر هەڵەیەك کەپێی ئاگاداری.

خوێنەری بەڕێز !

ئەم فەرموودەیە چوار برگە (مقطع) ی سەرەکی یە کەهەر کامێکیان بە (أسألك) دەست پێ دەکات و لەهەرکامێکیاندا چەند وەسیلەیەك لەدە (١٠) هۆو وەسیلە گرنگ و بنچینەیی یەکانی ڕێی صاڵحبوون و بەرەو خواچوون باسکراون :

لەبرگەی یەکەمدا وەسیلەی (١، ٢) کەبریتین لەلاقچەقاندن و خۆڕاگری لەکاتی

---

(٣٥) رواه الترمذي والنسائي وابن حبان، وأخرجه الحاكم و (خلقا مستقيما) من روايته، وقال: صحيح على شرط مسلم. بڕوانە: (تحفة الذاكرين) ی ئیمام شەوکانی، ل٢٨٥.

بەڕێوەبردنی ئیشو کاردا ، وەدڵبەهێزیو دامەزراوی لەسەرگرتنو هەڵبژاردنی چاکەو هەق ، خراونەڕوو . گومانیشی تێدا نیە ، کەلاقی چەسپاوو دڵی دامەزراو بناغەو بنچینەی هەر ئیشو کارێکن بەتایبەتی کاری ( بەخۆداهاتنەوەو بەرەو خوا گەڕانەوە ) !

لەبڕگەی دووەمیشدا وەسیلەی ( ٢ ، ٣ ) باسکراون ، کەبریتین لەسوپاسکردنی چاکەو نیعمەتی خواو ، چاكپەرستنی ، هەڵبەتە ئەمانیش توێشوو و سەرچاوەی وزەی بابای ڕێبواری ڕێی صاڵحبوونو بەرەو خواچوونن .

لەبڕگەی سێیەمیشدا هۆی ( ٥ ، ٦ ، ٧ ) خراونەڕوو ، کەدڵی ساغو زمانی ڕاستوپاكو ڕەوشتی بەرزو چاکن ، دیارە ئەمانەیش لەگرنگترین هۆیەکانی برینو تەواوکردنی ڕێگای ناوبراونو بۆ بابای ڕێبواری ڕێی گۆڕین وەك وڵاخی سواریو هەڵگری توێشوو وکەلوپەلو پێداویستییەکانی ئەو ڕێگایەیەتی .

پێویستە ئەوەش بگوترێ کەهەتا دڵ ساغو ڕووناك نەبێت ، زمان ڕاستو پاك نابێتو ، بەبێ دڵی ساغو ڕووناكو زمانی ڕاستو پاکیش ، ڕەوشتی بەرزوچاك دەستگیر نابێ . ئنجا لەکۆتاییدا لەبڕگەی چوارەمدا وەسیلەی ( ٨ ، ٩ ، ١٠ ) باسکراون کەبریتین لە سێ مەبەستی گرنگو ، وەك چەترو قەڵغانو کەلوپەلی خۆپاراستن لەسەرماو گەرماو دڕندەو جەردەو ڕێگری ڕێگاوان ، کەئەمانەن :

( أ ) داواکردنی هەرچی خێروچاکەیە لەخودا .

( ب ) پەنابردن لەهەرچی شەڕوخراپە بۆلای خودا .

( ج ) داوای لێبووردن کردن بۆهەرچی تاوانو هەڵەیە لەخوا .

ئیدی هیوادارم خوای بەرزو مەزنو بەخشەرو میهرەبان بەلوتفی خۆی هەرکام لەم ( ١٠ ) وەسیلەو پێداویستییە گرنگو بنچینەییانەمان پێببەخشێ .

## شەشەم :

# دە ( ١٠ ) پایەو بنچینەی گرنگی ڕێی بەرەو خواچوون

لەخاڵی پێشوودا لەبەر تیشکی فەرموودەیەکی پێغەمبەردا ﷺ ( ١٠ ) هۆو وەسیلەی گرنگی ڕێی صاڵحبوونو بەرەو خواچوون خرانەڕوو ، لێرەشدا لەبەر تیشکی فەرموودەیەکی دیکەی ئەو زاتە بەرزەدا ﷺ ( ١٠ ) پایەو بنچینەی گرنگی ئەو ڕێیە پڕ پیتو فەرە دەخەینەڕوو :

پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەیەکیدا کەبەگەورەترین شێوەی داوای لێبووردن کردن ( سید الإستغفار ) ی داناوە فەرموویەتی : ﴿ اللَّهُمَّ أنتَ رَبِّي لاالهَ إلاّ أنتَ ، خَلَقْتَنِي وَأنا عَبدُكَ

وَأنا عَلى عَهدِكَ وَوَعدِكَ ماستَطَعتُ ، أعوذُ بِكَ مِن شَرِّ ماصَنَعتُ أبوءُ لَكَ بِنِعمَتِكَ عَلَيَّ ، وَأبوءُ بِذَنبي ، فَاغفِر لي إنَّهُ لايَغفِرُ الذُنوبَ إلاّ أنتَ ﴾ (٣٦) ، واتە : ئەی خوایە ! تۆ پەروەردگارمی ، جگە لەتۆ هیچ خوا نین ، دروستت کردووم ، وەمن بەندەی تۆم ، وەمن بەپێی توانام هەر لەسەر پەیمانو بەڵێنی تۆم ، پەنات دێنمەبەر لەچەنگ خراپەی ئەوەی کەکردوومە ، دانت بۆ پێدا دێنم کەچاکەت بەسەر منەوە هەیە ، وەپێ لەهەڵەی خۆم دەنێم جا لێم ببورە ، چونکە جگە لەتۆ کەس لەگوناحان خۆش نابێت .

بەرلەوەی دەست بکەم بەنووسینو دەرهێنانی ئەو ( ١٠ ) بنچینە گرنگەی کەپێشتر باسم کردن لەدەریای پڕ گەوهەری ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ ، بەپێویستی دەزانم ڕاستی‌یەکی مەزن بخەمە بەرچاوی خوێنەری بەڕێز :

هەروەك چۆن دەریا زلەکان هەمیشە پڕن لەنێچیری بەنرخو گەوهەرو مرواری بەقیمەت ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەزۆر کەس بەسەریاندا دێو دەچێ ، بەس ڕاوچی‌یانی کارامەو مەلەوانانی زەبردەستو لێزان ، ئەو نێچیرو گەوهەرو مرواری‌یانە دەستگیر دەکەن ، ئایەتەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەریشمان ﷺ بەهەمان شێوە پڕپڕن لەحیکمەتو پەندو زانیاریو نهێنی قووڵو بەسوود ، بەڵام مەرج نیە هەرچی لەبەری کردنو مەعنای دەقی وشەکانی زانین ، بتوانێ پەی بەهەموو ئەو حیکمەتو زانیاریو نهێنی‌یە گرنگو بایەخدارانە بەرێ ، هەڵبەت بێجگە لەشارەزایی لەزمانو ئەدەبی عارەبی‌دا گەورەترین مەرجی بەهرەمەندبوون لەحیکمەتو نهێنی‌یە پەنهانەکانی قورئانو سوننەت بریتی‌یە لەپارێزکاری ( تقوی ) ، هەربۆیەش خوای زانا فەرموویەتی : ﴿ إنْ تَتَّقُوا اللّهَ يَجعَل لَكُم فُرقاناً . . . ﴾ الأنفال ( ٢٩ ) .

ئێستاش بابێینە سەر ئەسڵی مەبەستو ، ئەو ( ١٠ ) یاساو بنچینە گرنگو سەرەکی‌یەی کەگفتمان دابوو بیانخەینەڕوو :

١ ، ٢- دانهێنان بەپەروەردگارایەتی‌و یەکتایی خودا : ﴿ اللهُمَّ انتَ ربّي لااله إلاّ انتَ ﴾ . بێگومان خوا بەمشوورخۆرو گەورەو سەروەرو پەروەردگاری‌خۆ زانینو ، خوا بەیەك گرتنیش گەورەترین ڕاستی ( کبری الحقائق ) نو ، گرنگترین پایەی ڕێی بەرەو خواچوونیشن .

٣ ، ٤- دانهێنان بە بەدیهێنەرایەتی خوداو بەندایەتی خودا ﴿ خلقتني ، وأنا عبدك ﴾ . ئەمانیش دیسان دوو ڕاستی‌ی هەرە بنچینەیی‌و ، دوو بنچینەو مەرجی گرنگی سەرکەوتنو بەمرادگەیشتنن بۆ ڕێبواری ڕێی ناوبراو .

٥- ڕاگەیاندنی چەسپاوی لەسەر پەیمانو بەڵێنی خوا بەپێی توانا ﴿ وأنا على عهدك ووعدك ماستطعت ﴾ ، بەڵێ . . . نوێ‌کردنەوەی بەڵێنو پەیمان لەگەڵ خودا مەرجو بنچینەیەکی هەرەگرنگو پێویستی بابای ڕێبوار ( سالك ) ە .

٦- پەنابردنە بەرخوا لەچەنگ خراپەو تاوان ﴿ أعوذ بك من شر ماصنعت ﴾ ، ئەمیش

---

( ٣٦ ) رواه البخاري وأبو داود باختلاف يسير .

هەروەك چۆن وەسیلەو هۆی بەرەو خواچوونە ، پایەو بنچینەی ئەو سەفەرەشە .

٧ ، ٨ـ دانهێنان بەچاکەو نیعمەتی خواو خراپەو هەڵەی خۆدا ﴿ أبوء لك بنعمتك علي ، وأبوء بذنبي ﴾ .

٩ ، ١٠ـ داوای لێبووردن لەخواکردنو ، تەمابڕاوبوون لەغەیری وی ﴿ فاغفر لي إنه لايغفر الذنوب إلا أنت ﴾ .

ئەمانیش وەك ئەوانەی پێشەوە بەدوو ئیعتیباری جودا هەم پایەو بنچینەی ڕێگای ناوبراونو ، هەم وەسیلەو هۆشن .

## حەوتەم :

# ناوە چاکەکانی خوا چاکترین وەسیلەی صاڵحبوونو بەرەو خواچوونن

بەڵێ خوێنەری بەڕێز . . . باسکردنو تێوەڕامانی ناوو سیفەتە بەرزو پەسندەکانی خوا چ لەکاتی زیکرو پاڕانەوەداو چ لەحاڵەتی ئاساییدا ، گەورەترین دەوری هەیە لەسافبوونەوەی دڵو دەروونی ئینسانداو جوانبوونی خوو ڕەوشتیداو لەخوانزیك کەوتنەوەیدا . خوای بەرزو مەزن لەم بارەوە فەرموویەتی: ﴿ وَلِلَّهِ الأسماءُ الحُسنى فادعوُه بِها . . . ﴾ الأعراف ( ١٨٠ ) .

پێغەمبەریشمان ﷺ فەرموویەتی: ﴿ إنَّ لِلَّه تعالى تِسعَةً وَتِسعونَ إسمًا مِائة إلاّ واحِدًا ، مَن أحصاها دَخَلَ الجَنَّةَ ، إنَهُ وِترٌ يُحِبُّ الوِترَ ﴾ (٣٧) ، واتە : بێگومان خوای بەرز نەوەدو نۆ ناوی هەن سەد جگە لەیەکێك ، هەرکەسێك بیانژمێرێ دەچێتە بەهەشتێ ، بێگومان ئەو تاقەو تاقی خۆشدەوێ .

ئنجا پێغەمبەرمان ﷺ لەفەرموودەیەکی دیکەیدا کە ( ترمذیو ابن حبانو ابن خزیمتو حاکمو بیهقیو ابن ماجة ) گێڕاویانەتەوە ئەو ( ٩٩ ) ناوەی باس کردووە کەئێمە لێرەدا دەیاننووسینو بەکوردیش مەعنایان لێك دەدەینەوە :

﴿ هُوَ اللهُ الَّذي لاإلهَ إلاّ هُوَ :

---

( ٣٧ ) رواه الشيخان.

| | |
|---|---|
| ١ـ الرَّحمن | بەبەزەیی |
| ٢ـ الرَّحیم | بەخشندە |
| ٣ـ الملك | سەرۆك ، پادشا |
| ٤ـ القدُّوس | پاك |
| ٥ـ السَّلام | بێعەیب ، بێپەڵە |
| ٦ـ المُؤمِن | دڵنیاکەر ، بەڕاستدانەر |
| ٧ـ المُهَیمِن | بەسەرڕاگەیشتوو |
| ٨ـ العَزیز | زاڵ ، دەسەڵاتدار |
| ٩ـ الجَبّار | باڵادەست ، ناچارکەر |
| ١٠ـ المتَکَبِّر | خۆبەگەورەزان |
| ١١ـ الخالِق | درووستکەر ، بنیادنەر |
| ١٢ـ البارِئ | بەدیهێنەر |
| ١٣ـ المصَوِّر | وێنەکێش |
| ١٤ـ الغفّار | لێبووردە |
| ١٥ـ القَهّار | گەردنکەچکەر |
| ١٦ـ الوَهّاب | بەخشەر |
| ١٧ـ الرَّزاق | ڕۆزیدەر |
| ١٨ـ الفتّاح | دەرووکەرەوە |
| ١٩ـ العلیم | زانا |
| ٢٠ـ القابِض | لێگرەوە ، وێکهێنەر |
| ٢١ـ الباسِط | لەدوودەر ، فراوانکەر |
| ٢٢ـ الخافِض | دانەوێن ، نەویکەر |
| ٢٣ـ الرّافِع | بلندکەر ، بەرزکەرەوە |
| ٢٤ـ المُعِزّ | زاڵکەر |
| ٢٥ـ المُذِلّ | زەبوونکەر |
| ٢٦ـ السَّمیع | بیسەر |
| ٢٧ـ البَصیر | بینەر |
| ٢٨ـ الحَکَم | فەرمانڕەوا ، حوکمڕان |
| ٢٩ـ العَدل | دادگەر |
| ٣٠ـ اللطیف | چاکەکاری پەنهان ، وردبین |
| ٣١ـ الخبیر | شارەزا ، هەواڵدەر |
| ٣٢ـ الحلیم | هێدی ، ئارام |
| ٣٣ـ العظیم | مەزن |
| ٣٤ـ الغفور | لێبووردە ، گوناهپۆش |

٣٥ـالشَّكور ستایش کەر ، سوپاس گوزار
٣٦ـالعَليّ بەرز
٣٧ـالكبير گەورە
٣٨ـالحفيظ پارێزەر
٣٩ـالمُقيت بژیوگەیێن ، دەسەڵاتدار
٤٠ـالحَسيب لێپرسەرەوە
٤١ـالجليل سیفەت‌بەرز
٤٢ـالكَريم بەڕێز ، ڕێزگر
٤٣ـالرَّقيب چاودێر
٤٤ـالمجيبُ وەڵامگۆ
٤٥ـالواسِع فراوان
٤٦ـالحَكيمُ کاربەجێ ، لێزان
٤٧ـالوَدود بەندەدۆست ، خۆشویستراو
٤٨ـالمَجيدُ پایەبەرز ، خاوەن‌شکۆ
٤٩ـالباعِثُ زیندووکەرەوە ، نێرەر
٥٠ـالشَّهيد ئاگادار ، ئامادە
٥١ـالحَقّ پایەدار ، ڕاست ، هەق
٥٢ـالوَكيلُ کارپێ‌سپێرراو ، پشت و پەنا
٥٣ـالقَويّ بەتوانا
٥٤ـالمَتين بەهێز ، قایم
٥٥ـالوَلي دۆست ، یاریدەدەر
٥٦ـالحَميدُ سوپاسکراو ، شایستەی سوپاس
٥٧ـالمُحصي ژمێرەر
٥٨ـالمُبدِئ پەیداکەر
٥٩ـالمُعيد گێڕەرەوە ، زیندووکەرەوە
٦٠ـالمُحي ژیێنەر
٦١ـالمُميتُ مرێنەر
٦٢ـالحَي زیندوو
٦٣ـالقَيّوم مشوورگێڕ ، ڕاوەستاو
٦٤ـالواجِد هەبوو
٦٥ـالماجِد خاوەن پایەی بەرز
٦٦ـالواحِد یەك
٦٧ـالأحَد تاك ، تەنیا
٦٨ـالصَّمَد حەوجێ‌پێ‌بوو ، جێی مەبەست

| | |
|---|---|
| ٦٩ـ القادر | توانادار |
| ٧٠ـ المُقتَدِر | خاوەن سەرچاوەی توانا |
| ٧١ـ المُقَدِّم | پێشخەر |
| ٧٢ـ المُؤَخِّر | دواخەر |
| ٧٣ـ الأوَّل | یەکەمین |
| ٧٤ـ الآخِر | دوامین |
| ٧٥ـ الظَّاهِر | دیار ، ئاشکرا |
| ٧٦ـ الباطِن | ون ، پەنهان |
| ٧٧ـ الوالي | سەرپەرشتی کەر |
| ٧٨ـ المُتَعال | زۆربەرز ، خۆبەرزگر |
| ٧٩ـ البَّر | چاکەکار |
| ٨٠ـ التَّوّاب | تۆبەوەرگر |
| ٨١ـ المُنتَقِم | تۆڵەستێن |
| ٨٢ـ العَفُوّ | چاوپۆشی کەر |
| ٨٣ـ الرَّؤُف | میهرەبان |
| ٨٤ـ مالكُ المُلكِ | خاوەن مڵك |
| ٨٥ـ ذو الجلالِ والإكرام | خاوەن پایەی بەرزوڕێز |
| ٨٦ـ المُقسِط | دادپەروەر |
| ٨٧ـ الجامِع | کۆکەرەوە |
| ٨٨ـ الغَنيّ | دەوڵەمەند |
| ٨٩ـ المُغني | دەوڵەمەندکەر ، بێنیازکەر |
| ٩٠ـ المانع | بەرگر ، پێشگیری کەر |
| ٩١ـ الضّار | زیان گەیێن |
| ٩٢ـ النّافِع | سوودگەیێن |
| ٩٣ـ النّور | ڕووناکی |
| ٩٤ـ الهادي | ڕێ پیشاندەر |
| ٩٥ـ البَديع | داهێنەر ، بێ وێنە |
| ٩٦ـ الباقي | هەرماو |
| ٩٧ـ الوارِث | میراتگر |
| ٩٨ـ الرَّشيد | کارزان ، شارەزاکەر |
| ٩٩ـ الصَّبور | ئارامگر |

## چەند ئاگاداریەک دەربارەی ناوەکانی خوا

( ١ ) وەك لەو فەرموودانەوە کەڕابردن دەردەکەوێ ناوی ( الله ) جل جلاله لەڕیزی ( ٩٩ ) ناوەکان نەژمێرراوە ، دەنا دەیکردە ( ١٠٠ ) . بێگومان هەرواشە ، چونکە فەرموودەکەدەڵێ: ﴿ إنَّ للهِ . . . ﴾ کەواتە ئەو ( ٩٩ ) ناوە هەموویان سیفەتی ( الله ) نو وەسفی ئەویان پێ کراوە .

( ٢ ) مەبەست لەڕستەی: ﴿ من أحصاها دَخَلَ الجَنَّةَ ﴾ لەسەر ڕای زۆربەی زانایان لەبەرکردنو تێگەیشتنو بیرلێکردنەوەی ئەو ناوە بەرزو پەسندانەیە .

( ٣ ) کاریگەری ئەو ناوە بەرزو چاکانە بۆ چاککردنی ئینسانو لەخوا نزیك‌خستنەوەیدا ، لەو ڕووەوەیە کەخوای بەرزو مەزن پێی خۆشە بەناوو سیفەتە بەرزەکانی مەدحی بکەین ، وەهەتا زیاتریش ئەو ناوو سیفەتە بەرزو چاکانەی خوا لەدڵو مێشکی ئینساندا جێگیربینو پتر بیریان لێ‌بکاتەوە ، زیاتر کاردەکەنە سەر دەروەروونیو لەسیفەتی بەرزو ڕەوشتی پەسند نزیکتر دەبێتەوەو لەناسینی خوادا شارەزاتر دەبێو قاڵتر دەبێتەوە (٣٨) .

کەواتە :

کێ دەیەوێ دەست لەچاکترینو کاریگەرترین وەسیلەی بەرەو خواچوونو صاڵحبوون گیربکات ، بائەم ناوە بەرزو چاکانە بەڕەوانیو بەمەعنای ڕوونەوە لەبەربکاتو سەرنجی وردو قووڵیان لێ‌بدات ، وەلەکاتی پاڕانەوەو ڕازو نیازدا پێیان لەخوا بپاڕێتەوە ، بەڵام گرنگ بیرلێکردنەوەو بەدڵدا هێنانی مەعناو مەبەستیانە .

### هەشتەم :

## دەروولێکرانەوە بەرهەمی بەردەوامبوونە لەسەر داوای لێبووردنکردن

بەڵێ پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەرموویەتی: ﴿ مَن لَزِمَ الإستِغفارَ جَعَلَ اللهُ لَهُ مِن كُلِّ

---

( ٣٨ ) لەهەرکام لە ( الأذکار ) ی ئیمام نەوەویو ( تحفة‌الذاكرين ) ی ئیمام شەوکانیدا ، ناوە بەرزەکانی خوا نەقڵ کراون . بڕوانە : الأذکار ، ل٩٤ ، وەتحفة‌الذاكرين ، ل٥٣ . ئەوەندەهەیەلەکتێبی ( الأذکار ) دا ناوی ( الأحد ) کەژمارەکەی ( ٦٧ ) ە پەڕێنراوەو ، جگەلەناوی ( الله ) ژمارەی ناوەکان ( ٩٨ ) ە ، بەڵام ( تحفة الذاكرين ) بەو شێوەیەی هێناون کەمن نووسیومن .

هم فرجا ، وَمِن كُلِّ ضَيْقٍ مَخرَجًا ، وَرَزَقَهُ مِن حيثُ لايَحتَسِبُ » ( ٣٩ ) ، واتە : هەرکەسێ هۆگری داوای لێبووردنکردن بێت ، خوا لەهەموو دڵتەنگییەك ڕزگارییەكو لەهەموو سەغڵەتییەك دەرووێکی بۆ دەرەخسێنێ ، وەبێئەوەی پێبزانێ ڕۆزی دەداتێ .
بەڵێ خوێنەری بەڕێز !
هەرچی گیرو گرفتو دەردەسەریو نارەحەتی ماددیو مەعنەوییە ، بەزۆری هۆیەکەیان لەڕێلادانو خراپەوتاوانی خۆمانە ، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی : ﴿ وَما أصابَكُم مِن مُصيبَةٍ فَبِما كَسَبَت أيديكُم ﴾ الشورى ( ٣٠ ) ، واتە : وەهەربەڵایەکتان تووشدێ بەهۆی کردەوەی دەستی خۆتانەوەیە .
دیسان فەرموویەتی : ﴿ ظَهَرَ الفَسادُ في البَرِّ والبَحرِ بِما كَسَبَت أيدي النّاسِ ﴾ الروم ( ٤١ ) ، واتە : خراپەو ئاشووب لەئیشکانیو دەریادا ئاشکرابوو بەهۆی کردەی دەستی خەڵکییەوە ( دیارە مەبەست لەخراپەو تاوانەکانیانە ) .
دەجا هەروەك چۆن لاڕێبوونو لەخوا دوورکەوتنەوە ماکو سەرچاوەی هەموو بەڵاو گروگرفتێکە ، چاکەکردنو داوای لێبووردنکردنو گەڕانەوەش مەڵحەمی ساڕێژکەری هەموو برینو زامێکی ماددیو مەعنەوی ژیانی مرۆڤە .
هەربۆیەش دەبینین پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوا ﴿ صلى الله عليهم وسلم ﴾ فەرمانیان بەگەلەکانیان کردووە کەبۆئەوەی دەرووی خێری ماددیو مەعنەوییان لێ بکرێتەوە ، بابگەڕێنەوە لای خواو داوای لێبووردنی لێبکەن ، بڕوانە :

( ١ ) خوا لەسەر زمانی ( نوح ) عليه السلام فەرموویەتی : ﴿ فَقُلتُ استَغفِروا رَبَّكُم إنَّهُ كانَ غَفّارًا يُرسِلِ السَّماءَ عَلَيكُم مِدرارًا وَيُمدِدكُم بِأموالٍ وَبَنينَ وَيَجعَل لَكُم جَنّاتٍ وَيَجعَل لَكُم أنهارًا . . . ﴾ نوح ( ١٠-١١ ) .

( ٢ ) وەلەسەر زمانی ( هود ) عليه السلام فەرموویەتی : ﴿ وَياقَومِ استَغفِروا رَبَّكُم ثُمَّ توبوا إلَيهِ يُرسِلِ السَّماءَ عَلَيكُم مِدرارًا وَيَزِدكُم قُوَّةً إلى قُوَّتِكُم . . . ﴾ هود ( ٥٢ ) .

( ٣ ) - یونس - یش عليه السلام ، دوای ئەوەی نەهەنگ قووتیدا بێجگە لەدان بەهەڵەی خۆ داهێنانو خۆ بەستەمکاردانانو داوای لێبووردنکردن ، هیچ شتێکی دیکەی لەفریا نەهات ، بۆ قوتاربوونو دەروولێکرانەوە ، وەك خوای لێبوورده فەرموویەتی : ﴿ وَذا النّونِ إذ ذَهَبَ مُغاضِبًا فَظَنَّ أن لَن نَقدِرَ عَلَيهِ فَنادى في الظُّلُماتِ أن لاإلهَ إلاّ أنتَ سُبحانَكَ إنّي كُنتُ مِنَ الظّالِمينَ فَاستَجَبنا لَهُ وَنَجَّيناهُ مِنَ الغَمِّ وَكَذلِكَ نُنجي المُؤمِنينَ ﴾ الأنبياء ( ٨٧-٨٨ ) .

---

( ٣٩ ) رواه أحمد وأبو داود وابن ماجة .

## نۆیەم :

# بەرچو کۆسپەکانی سەر ڕێی بەرەو خواچوون

خوێنەری خۆشەویست !

بێگومان ڕێگای صالحبوونو بەرەو خواچوون ڕێگایەکی سەختو دژوارو پڕ مەترسییەو کۆسپو لەمپەری زۆری لەسەرنو ، گەلێك جەردەو ڕێگری جۆراوجۆر خۆیان لەلاو ئەولای ئەو ڕێیەدا مەڵاسداوەو ، هەر لەدەرفەتێك دەگەڕێن بۆ زەفەر پێبردنی بابای ڕێبوار . جائەوە لێرەدا لەهەشت خاڵاندا زۆر بەکورتی سەرژمێرێکی ئەو چەپەرو کۆسپانە دەکەین ، بۆئەوەی لەلامان نامۆو نەناسراو نەبنو لەنەکاو بەسەریاندا نەکەوینو نەزانانە لەبۆسەی بەدیان نەکەوین :

## ١- خراپ حاڵیبوون لەئیسلام :

لەڕاستیدا خراپ حاڵیبوون لەئیسلام کەزۆر شت دەگرێتەوەو گەلێك شتان دەگەیەنێ ترسناکترینو بەزەرترین کۆسپو لەمپەری سەر ڕێی ناوبراوە ، چونکە بابای ناتێگەیشتووی خۆبەتێگەیشتووزان دووچاری دەردی نەزانیی ئاوێتە ( الجهل المركب ) بووەو ڕێیەکی خواری سەر بەهەڵدێرگەیەنەری گرتۆتە پێشو گومانیشی وایە بەڕێیەکی ڕاستو ڕەواندا بەرەو ئامانج دەڕوات !

جائەوە لێرەدا زۆر بەکورتیو گوشراوی یەکێك لەو مەسەلانە دەتوێژینەوە کەخەڵکێکی زۆر تێیدا بەهەڵەداچووەو دووچاری لاڕێبوونو هەتلەبوون بووە ، ئەویش بریتییە لە :

( مەسەلەی سەلەفیبوونو مەزهەبیبوون )

گەلێك کەس لەم مەسەلەیەدا بەهەڵە چوو ونو دووچاری زیادەڕۆییو بەزایەدان ( إفراط وتفريط ) بوو ون ، بڕوێنە : ئی واهەیە لافی سەلەفیبوونو شوێنکەوتنی زانایانی پێشین ( سلف ) لێدەداتو دەڵێت : من تەقلید بەڕەوا نازانمو یەکسەر لەقورئانو سوننەتەوە هەڵدێنجمو بەپێویستی نازانمو هەر بەدرووستیشی نازانم وەدوای شافیعیو مالیكو ئەبوو حەنیفەو ئەحمەد ( رحمهم الله ) بکەوم ، بەڵکو وەك چۆن ئەوان ئیجتیهادیان کردووە منیش ئیجتیهاد دەکەم ، چونکە ( هم رجال ونحن رجال ) ! !

ئنجا جێی خەفەت ئەوەیە کەئەو جۆرە مسوڵمانانە نەك هەر قورئانو سوننەتو بەرهەمو کەلەپووری زاناو پێشەوایانی پێشینیان موتاڵا نەکردووەو تێیان نەگەیشتوون ، بەڵکو ئەوەندەی من

دەیانناسمو پێیان ئاشنام زۆربەی هەرە زۆریان تەنانەت ڕاستەمەعنای زۆربەی ئایەتەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەریش ﷺ نازانن‌و، بەدەگمەن نەبێ لەزانیارییەکانی زمان ( نحو، صرف، بلاغة ) و ( أصول الفقه ) هێندە کۆڵەوارو دەستە پاچەن کەناتوانن نەك لاپەڕەیەك بگرە دێڕێکی ( تحفة المحتاج ) و ( جمع الجوامع ) بەڕاستی بخوێننەوەو، کەبۆیان باسی ( مطلق ومقيد، عام وخاص، مجمل ومفصل، مفهوم ومنطوق، عبارة النص وإشارة النص، تعارض وترجيح، ناسخ ومنسوخ . . . هتد ) دەکەی، وەك گوێزانیان بۆ بزمێری پێیان وایەو، هیچ لەهیچ حاڵی نابن ! !

بەڵام دەردی لەهەموو دەردان گرانتر ئەوەیە کەلەبەرانبەر ئەو جۆرە ( سەلەفی ) یانەداو، لەکاردانەوە ( رد فعل ) ی ڕەفتاری ناقۆڵایان لەگەڵ زاناو پێشەوایانی پێشینمانو بەرهەمو کەلەپووری قووڵو فراوانو ڕەسەنیاندا، کۆمەڵێکی دیکەی بەناو مەزەبی ڕاست بوونەوەو، بەناوسەلەفییەکان چەندەیان ئەدەب دەنواند لەبەرانبەر زاناو چاوساغو پێشەوایاندا، ئەمانیش بەئەندازەی وان ڕێزو ئەدەب پێشان دەدەن دەربارەی قورئانو سوننەت ! !

بەواتایەکی دیکە هەروەك چۆن خۆبەسەلەفی زانەکان بەبیانووی ڕێز لەقورئانو سوننەت گرتنەوە، لەسۆنگەی نەزانیو ئیشکییانەوە خۆیان دووچاری بێڕێزی نواندن بەرانبەر بەزاناو پێشەوایان کردبوو، خۆبەمەزهەبیزانەکانیش لەسۆنگەی سەرکێڵیو بیرتەسکییانەوە بەبیانووی ڕێز لەزاناوپێشەوایان گرتنەوە خۆیان گیرۆدەی بێحورمەتی نواندن بەرانبەر بەقورئانو سوننەت کردووە ! !

بەڵام بێگومان هەرکام لەو دوو کۆمەڵە دژبەیەکە بەهەڵەدا چوون، چونکە هەرکەسێك ڕێز لەو زاناو پێشەوا ڕەسەنو پێشینانە نەگرێ کەخواو پێغەمبەر ﷺ ڕێزیان لێگرتوونو قورئانو سوننەتیان بۆ شەرحو تەفسیر کردووین، مانای وایە ڕێزیشی لەقورئانو سوننەت نەگرت ! وەهەرکەسێکیش ڕێزو حورمەتی تەواو بۆقورئانو سوننەت دانەنێ بەهۆی سەرنجدانو سود لێوەرگرتنیانەوە، مانای وایە ڕێزیشی لەو زاناو چاوساغە بەڕێزانە نەگرتووە کە خۆی بەشوێنکەوتوویان دادەنێ، چونکە ئەو بەڕێزانەش هەربەهۆی ڕێزگرتنی تەواویان لەقورئانو سوننەتەوە قەدرو حورمەتیان پەیداکردووەو، دیسان ئەو بەڕێزو پایەبەرزانە شوێنکەوتوانی خۆیانیان ڕاسپاردووە بەشوێنکەوتنی قورئانو سوننەتو ڕێزلێگرتنیان !

کەواتە :

سەلەفییەتی زانایانەو مەزهەبییەتی عاقڵانە نەك هەر دژی یەك نینو تێك ناگیرێن، بەڵکو دوو ڕووی یەك حەقیقەتنو لەنێوەرۆکدا یەکن، چونکە :

( أ ) ـ سەلەفیی ڕاستەقینە دەزانێ کەمەسەلە بەس ئەوە نیە وەدوای قورئانو سوننەت بکەوێ، بەڵکو مەسەلە ئەوەیە کەبەشێوەیەکی زانایانەو ڕاست وەدوایان بکەوێ، نەك کوێرانەو بەپێخواسی وەنێو بکەوێ، بێئەوەی پێداویستییەکان ( مستلزمات ) ی لەقورئانو سوننەت حاڵیبوونی ئامادە کردبێو سەرنجی بەرهەمو کەلەپووری زاناو پێشەوایانی پێشینی دابێ داخوا چۆنیان لێحاڵی بوون، چونکە قورئان پێی

فەرمووە : ﴿ وَلاتَقْفُ مالَيسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ . . . ﴾ الإسراء ( ٤٦ ) ، وەپێی فەرمووە : ﴿ فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لاتَعْلَمُونَ ﴾ النحل ( ٤٣ ) .

( ب ) وە مەزهەبیی ڕەسەن دەزانێ کە مەسەلە هەر بەوەندە نابڕێتەوە بڵێ : من پەیڕەوی لەفەرموودەکانی شافیعیو زانایانی دیکەی مەزهەبی شافیعی یان هەر مەزهەبێکی دیکە دەکەم ، بەڵکو دەبێ بەو شێوەیە بەدوای شافیعیو هەر زاناو پێشەوایەکی دیکەش بکەوێ کەقورئانو سوننەتو ئەو زانا بەڕێزانەش بۆیان دیاری کردووە !

کەواتە مسوڵمانی ژیرو تێگەیشتوو لەو ڕووەوە کەبەپێی ڕێڕوونیەکانی زانایانی پێشین ڕێز بەقورئانو سوننەتان دەگرێ لەپێش هەموو شتێکەوە دایان دەنێ ، سەلەفییە . وەلەو ڕووەوە کەبەپێی ڕێڕوونییەکانی قورئانو سوننەت ڕێز لەزاناو چاوساغان دەگرێو وەگەڵیان بەئەدەب دەبێ ، مەزهەبییە . بەواتایەکی دیکە ؛ مسوڵمانی ژیرو تێگەیشتوو نەبەبیانووی سەلەفیبوونەوە سەرگەردان دەبێو ئەدەب فڕێ دەدات ، نەبەبیانووی مەزهەبیبوونیشەوە عەقڵی خۆی واز لێدێنێو خۆی کۆتو زنجیر دەکات .

هەڵبەتە ئەم مەسەلەیە توێژینەوەی زیاتری گەرەکە ، بەڵام لێرەدا دەرفەت نیەو خوا پشتیوان بێ لەداهاتوودا لەنامیلکەیەکی سەربەخۆدا بەتێرو تەسەلی دەیتوێژینەوە .

ئنجا بالەبەر تیشکی ئەم مەسەلەیەدا سەرنج بدەین داخوا خراپ لەئیسلام حاڵیبوون چۆنو بۆچی یەکێکە لەکۆسپە هەرە بێرەزایەکانی ڕێی صاڵحبوونو بەرەو خواچوون ؟ ! !

جارێ ئەو کەسەی کەبەحیسابی خۆی خۆی بەسەلەفی دەزانێو پێشی وایە ( سەلەفی ) بوون بەس بەوەندە پێکدێ قسەو دەعوای زلزل بکاتو هەر بەقسە خۆی بەرێتە ریزی أبوحنیفةو سفیان الثوریو أحمدو أبوثورو أبوداود الظاهریو ابن حزمو ابن تیمیەو غزالیو . . . هتدەوە ئنجا بەخەیاڵی خۆی وابزانێ ئەو زانا بەڕێزانە چەندەو چۆن لەقورئانو سوننەت حاڵی بوو ون ئەویش هێندەو ئاوای بێکەمو زیاد حاڵی دەبێو ، سەرەنجام ئەو بیرکردنەوە هەڵەو ئەفسانەییە بەو ئەنجامەی دەگەیەنێ کەخۆی بەحەوجێی کتێبو بەرهەمی هیچ زانایەك نەزانێو کوێرانە ڕێ بگرێتەبەرو خۆی لەو دەریا دەوڵەمەندو پڕ گەوهەرو مرواریەی ئەو زاناو پێشەوا بەرزانە بێبەش بکاتو وەك ئەو فەقیر حاڵەی لێبێ کەبەنوێژی نیوەڕۆیە واز لەتیشکی زێڕینی خۆر دێنێو شەمشەمەکوێرانە دەچێتە پشتیرو ژێرخانێکی تاریکو تەڵەمەوە لەوێدا بەفتیلەو چرا ڕەشکە بێشۆقو تفنك ڕەشکەرەکەی خۆی قەناعەت دەکات ! !

وەئەو کەسەش کەپێی وایە بەدوای ڕێڕوونی زاناو پێشەوایان کەوتووەو لەدەریای زانیاریو شارەزاییان بەهرەمەند بووەو ، لەمەوە بەهانەی دەستکەوتووەو قورئانو سوننەتی پشتگوێ خستوو ون ، وازی لەو سەرچاوە ڕوونە هێناوە کەزانایانی ڕەسەنی لێ تێراو بوونو لەسەر پێگەیشتوون ، بەو جۆرە خۆی لەپیتو بەرەکەتی تایبەتی قورئانو سوننەت بێبەش کردووەو پەکی خۆی خستووە ! !

بەڵێ بێگومان هەر کام لەم دوو جۆرە کەسە لەبەر نەزانیو ئیشکیو بیرتەسکی خۆیانو خراپحاڵیبوونیان لەئیسلام گەورەترین کۆسپو چەپەرو تانەیان لەڕێی خۆیاندا درووست کردوەو خۆیان گیرۆدەی دوو دەردی ( قەسوەتو بیدعەت ) کردووە .

ئنجا شایانی باسەکەمەسەلەی ( سەلەفی‌یەتو مەزهەبی‌یەت ) (٤٠) تاقە مەسەلەیەك نیە کەخەڵکێکی زۆری تێدا بەهەڵە چووەو ، بەهۆی ئەو خراپ حاڵیبوونەشەوە کۆسپو لەمپەرێکی یەکجار سەختو بێڕەزایان لەڕێگای صاڵحبوونو بەرەو خواچوونی خۆیانو خەڵکیدا درووستکردووە ، بەڵکو خراپ حاڵیبوون لەگەڵێك مەسەلەی دیکەش هەمان پەرێزو شوێنەواری بەدی لەنێو خەڵکی مسوڵماندا پەیداکردووە ، وەك مەسەلەی ( پەروەردە ) و مەسەلەی ( جیهاد ) و مەسەلەی ( تصوف ) و مەسەلەی ( سیاسەت ) و مەسەلەی ( سەر بەکۆمەڵو ڕێکخراوێکی تایبەتی‌بوون ) و . . . هتد (٤١) .

## ١- گوناحە ڕواڵەتی‌یەکان :

یەکی دیکە لەکۆسپو پەرچەکانی ڕێگای صاڵحبوونو بەرەو خواچوون بریتی‌یە لەگوناحو تاوانە ڕواڵەتی‌یەکان ( الآثام الظاهرة ) ، مەبەستیشم لەو جۆرە گوناحانە ئەوانەن کە بەهۆی ئەندامە ڕواڵەتی‌یەکانی وەك : چاوو زمانو گوێو دەستو لاقو گەدەو . . . هتد ئەنجام دەدرێن ، هەر لەڕوانینی حەرام ( النظر الحرام ) و فیکەکێشانو چەپڵەلێدانو جگەرەکێشانەوە - کەبەڕای زۆربەی زانایان گوناحی گچکەن - بگرە هەتا درۆو غەیبەتو بوختانو دووڕوویی‌و قسەهێنانو بردنو گاڵتە بەخەڵك‌کردنو مەیخواردنەوەو حەرامخۆری‌و قومارو دزی‌و زیناو قەتڵی بەناهەقو کوفرکردن کەبەڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایان هەموویانو هاو وێنانیشیان گوناحی گەورەن .

بەڵێ خوێنەری خۆشەویست !

هەرکام لەم گوناحانە چجای هەندێکیان یان زۆربەیان کۆسپو تەگەرەو لەمپەری ڕێی صاڵحبوونو بەرەو خواچوونن ، هەبۆیەش خوای میهرەبانمان فەرموویەتی : ﴿ وَذَرُوا ظَاهِرَ الإثم . . ﴾ الأنعام (١٢٠) ، واتە : وەواز لەگوناحە ئاشکراکان بێنن . . .

پێغەمبەریشمان ﷺ فەرموویەتی : ﴿ إنَّ العَبدَ إذا أخطأَ خَطيئةً نُكِتَ في قَلبِهِ نُكتَةٌ سَوداءُ فإن هُوَ نَزَعَ وَاستَغفَرَ وَتابَ صُقِلَ ، فإن عادَ زِيدَ فيها حَتّى تَعلوَ

---

(٤٠) دیارە لێرەدا چەمكو واتای « شوێنکەوتنی قورئانو سوننەت » بۆ وشەی « سەلەفی‌بوون » و « ڕێزگرتنو بەهرەمەندبوون لەبەرهەمی زانایان » بۆ وشەی « مەزهەبی‌بوون » لەبەرچاو گیراون کەبێگومان ئەم دوو ڕێڕەوە بەم دوو چەمكو واتایە نەك هەر دژو پێچەوانەی یەکتر نین ، بگرە تەواوکەری یەکتریشن ، وەلەڕاستی‌دا هەموو مسوڵمانێکی زاناو ژیر پێویستە هەرکام لەم دوو ڕێڕەوە ( إتجاه ) ەی بەم دوو چەمكو مەعنایەی سەری تێدابن .

(٤١) لەکتێبی ( بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامی ) دا کەمۆزۆر ئەم جۆرە مەسەلانە توێژراونەوە .

قَلْبُهُ . . . ﴾ (٤٢) .

## ٣ـ گوناحە دەروونی یەکان :

گوناحە پەنهانو دەروونی یەکان بەڕای زۆربەی زۆری زانایان لەگوناحە ڕواڵەتی یەکان خراپترو بەزەڕترن ، بەڵام ئێمە بەقەستی خستمانن دوای گوناحە ڕواڵەتی یەکانەوە ، لەبەرئەوەی لەهەستپێ کردندا لەدوای وانەوە دێن .

ئنجا شتێکی ئاشکراو ڕوونە کەسەرلەبەری ئەو جۆرە تاوانانە سەرچاوەکەیان عەقڵو دڵی ئینسانەو پەیوەندی یان بەئەندامە ڕواڵەتی یەکانی جەستەوە نیە ، وەپێویستە ئەوەش بگوترێ کە ئەو گوناحو تاوانە دەروونی یانە ئەسڵو بنکی سەرلەبەری گوناحە ڕواڵەتی یەکانیشن ، بڕوانە :

تۆ تەنیا کاتێك غەیبەتی کەسێك دەکەی کەدەروونت بوغزو کینەو حەسەدی بەرانبەر بەوی تێدا جێگیر بووبێ . ـ هەڵبەتە ئەم یاسایە ڕیزپەڕی تێدەکەون .

ئنجا گوناحە دەروونی یەکانیش مەگەر چۆنەکایی دەنا هەموویان تاوانی گەورە ( کبیرة ) نو گچکەیان نیە ، ئەمانەش چەند نموونەیەکی ئەم جۆرە تاوانانەن :

کوفر ، نیفاق ، شیرك ، خۆبەزلگری ، حەسوودی ، بوغز ، کینە ، خۆپەسندی ، ڕیا ، بەدگومانی ، خەڵك بەکەمزانین ، نارازیبوون بەقەزاو قەدەری خوا ، ڕژدی ، متمانە بەخودا نەبوون ، دنیا خۆشترویستن لەدواڕۆژ . . .

بەڵێ خوێنەری بەڕێز ! ئەگەر دەتەوێ ڕێی خۆچاککردنو بەرەو خواچوون بگریە پێش ، لەپێشەوە هەوڵبدە خۆت لەم گوناحو تاوانە پیسە دەروونی یانە قوتار بکەی کەهەرکامێکیان بەربەستو کۆسپێکی یەکجار ترسناکە لەو ڕێیە بەرزو پیرۆزەدا ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ﴿ لاتَدخُلُ المَلائِكَةُ بَيْتًا فيهِ كَلبٌ وَلاصورَةٌ (٤٣) ، واتە : فریشتە ناچنە ماڵێکەوە کەسەگو بتی (٤٤) تێدابن .

جائەگەر نەچنە ماڵێکەوە کەتەنیا سەگێك یان بتو سەنەمێکی تێدابێت ، چۆن تیشکی بڕواو هیدایەتی خوا بەدڵێك ڕازی دەبن کەیەکێك یان پتر لەو تاوانە دەروونی یانەی تێدا نیشتەجێ بووبن ، کەهەرکامێکیان لەسەگ پیسترو لەبتو سەنەم بەزەڕترو نەگریسترن ؟ !

## ٤ـ زیاد لەپێویست گرنگی دان بەژیانی دنیا :

بەڵێ . . . هەرچەندە ژیانی دنیا خۆی لەخۆیدا چاکترینو گەورەترین چاکەو نیعمەتی

---

( ٤٢ ) رواه النسائي والترمذي وابن ماجة .

( ٤٣ ) متفق عليه .

( ٤٤ ) دیارە وشەی ( صورة ) جگە لەبتو صەنەم وێنەش دەگرێتەوە ، واتە وێنەیەك کەبەدەست درووست کرابێ .

خوایە بۆ ئینسان هەربۆیەش پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ لاتَسُبُّوا الدُّنيا فَنِعمَ مَطيَّةُ المُؤمِنِ . . . ﴾ (٤٥) ،واتە: جنێو بەدنیا مەدەن چونکە باشترین وڵاخی سواری ئینسانی بڕوادارە . . .

بەڵام بەدەردی پێشینان دەڵێن: هەموو شتێك بەخوێ ،خوێش بەمەعنا ،لەکاتێکدا ژیانی دنیا زیاد لەئەندازەی پێویست گرنگیی پێدەدرێو دەکرێتە ئامانج ،دەبێتە بێرەزاترین کۆسپو چەپەری سەر ڕێی صاڵحبوونو بەرو خواچوون ،هەربۆیەش خوای زانا خۆشەویستیو هەڵبژاردنی ژیانی دنیای کرردۆتە مایەی چوونە نێو دۆزەخ: ﴿ فَأَمَّا مَن طَغى وآثَرَ الحَياةَ الدُّنيا فَإنَّ الجَحيمَ هيَ المَأوى ﴾ النازعات (٣٧-٣٩) ،وەکردوویەتی بەدرووشمو نیشانەی کافرو بێبڕوایان: ﴿ .وَوَيلٌ للكافِرينَ مِن عَذابٍ شَديدٍ الَّذينَ يَستَحِبُّونَ الحَياةَ الدُّنيا على الآخِرَةِ . . . ﴾ إبراهيم (٢-٣)

بەڵگەش لەسەر سەلماندنی ئەو ڕاستییە- کەزیاد لەپێویست گرنگیدان بەژیانی دنیا کۆسپو بەربەستێکی گەورەیە لەڕێی ناوبراودا- زۆرن ،بەڵام لێرەدا دەرفەت کەمەو تەنها ئاماژە بۆ یەکێك لەبەڵگانە دەکەین:

لەجەنگی ( ئوحود ) دا ،دوای ئەوەی تیرهاوێژەکانی سەرچیا فەرمانی پێغەمبەریان شکاندو شوێنەکانیان بەجێهێشتو بەقسەی فەرماندەکەشیانیان نەکرد ،مسوڵمانان سەرکەوتنی سەرەتای جەنگەکەیان لێ بوو بەتێشکانو حەقتا ( ٧٠ ) کەسیشیان لێ شەهیدکرا ،جاخوای کاربەجێ بەو بۆنەوە فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَد صَدَقَ اللهُ وَعدَهُ إذ تَحُسُّونَهُم بِإذنِه حَتّى إذا فَشِلتُم وَتَنازَعتُم في الأمرِ وَعَصَيتُم مِن بَعدِ ماأراكُم ماتُحِبُّونَ مِنكُم مَن يُريدُ الدُّنيا وَمِنكُم مَن يُريدُ الآخِرَةَ . . . ﴾ آل‌عمران (١٥٢)

لەم ئایەتە بەپێزەدا خواوەندی زانا ئاماژە بۆ چەند هۆیەك دەکات کەبوونە هۆی دۆڕاندنی جەنگی ئوحد ،بەڵام پاشان ئەسڵو بنکی هەموویان بەخۆشویستنی دنیا ﴿ مِنكُم مَن يُريدُ الدُّنيا ﴾ دادەنێ بەم شێوەیە:

حَتّى إذا فَشِلتُم ⟵ وَتَنازَعتُم في الأمرِ ⟵ وَعَصَيتُم ⟵ مِن بَعدِ ماأراكُم ماتُحِبُّونَ = مِنكُم مَن يُريدُ الدُّنيا ! !

بەڵێ . . . بەهۆی زیادلەپێویست خۆشویستنو گرنگیدان بەژیانی دنیا تیرهاوێژەکان کۆکردنەوەیماڵو غەنیمەتیان لەجێبەجێکردنی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ لەلا گرنگتر بوو ! بۆیە خەرکردنەوەی غەنیمەت دووچاری فەرمانشکاندن ( عصیان ) ی کردن ،بەهۆی فەرمان شکاندنیشەوە گیرۆدەی دەردی ناکۆکی ( تنازع ) بوونو سەرەنجام تێشکان ( فشل ) یەخەی گرتن ! !

---

(٤٥) أخرجه الديلمي.

## ٥- شوێنکەوتنو لاساکردنەوەی کوێرانەی پێشینانو دەوروبەر

ئەوە کەلاساکردنەوەو شوێنکەوتنی کوێرانەی پێشینانو دەوروبەری خواروهەڵە دەورێکی گرنگی هەیە لەلادانو گێڕانەوەی ڕێبوارانی ڕێی صاڵحبوونو بەرەو خواچووندا، ڕاستی‌یەکی مێژوویی‌و واقیعی‌و بەرچاوەو خوای بەرزو مەزنیش لەزۆر جێیان ئیشارەتی پێ‌کردووەو پێغەمبەریش ﷺ لەچەند فەرموودەیەکدا باسی‌کردووە، بۆنموونە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَكَذلكَ ماأرسَلنا مِن قَبلكَ في قَريةٍ مِن نَذيرٍ إلاّ قالَ مُترَفوها إنّا وَجَدنا آباءَنا على أمّةٍ وَإنّا على آثارِهم مُقتَدونَ ﴾ الزخرف (٢٣) .

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَإذا قيلَ لَهُمُ اتَّبِعوا ماأنزَلَ اللهُ قالُوا بَل نَتَّبِعُ ماألفَينا عَلَيهِ آباءَنا أوَلَو كانَ آباؤُهُم لايَعقِلونَ شيئًا وَلايَهتَدونَ ﴾ البقرة (١٧٠) .

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ﴿ مامِن مَولودٍ إلاّ يولَدُ على الفِطرَةِ فَأبَواهُ يُهَوِّدانِهِ أو يُنَصِّرانِهِ أو يُمَجِّسانِه، كَما تُنتَجُ البَهيمَةُ بَهيمَةً جَمعاءَ هَل تُحِسّونَ فيها مِن جَدعاءَ؟ ﴾ (٤٦) .

بەڵێ . . . بابو باپیرانو خەڵكو دەوروبەر دەورێکی کاریگەریان هەیە بۆسەر ئینسان چبەلای چاکەدا ئەگەر چاکبنو، چبەلای خراپەو لاداندا ئەگەر خوانەخواستە خراپو لار بن، هەربۆیەش ئیسلام گرنگی‌یەکی زۆر بەچاککردن ( إصلاح ) ی کۆمەڵگا دەدات لەهەموو لایەنەکانی فیکری‌و ئەخلاقی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و سیاسی‌یەوە، چونکە هەروەك چۆن عەقڵی ساغ لەجەستەی ساغ دایە ( العقل السليم في االجسم السليم ) ، بەهەمان شێوەش مرۆڤی ساغ لەکۆمەڵگای ساغدایە ( الإنسان السليم في المجتمع السليم ) .

## ٦- بێ‌مامۆستایی‌و چاوساغی:

گرنگی‌و پێویستی ڕابەرو ڕێپێشاندەر لەهەموو بوارێکی ژیانی ئینساندا مەسەلەیەکی ڕوونو ئاشکرایەو مشتو مڕ هەڵناگرێ . بەڵام لەبواری صاڵحبوونو بەرەو خواچووندا ئەوە ئەو گرنگی‌و پێویستی‌یە زیاتر دەبێتە مەسەلەیەکی ئاشکراو بەڵگەنەویست، چونکە مەسەلەی صاڵحبوونو بەرەو خواچوون وەك لەپێشەوەش گوتمان یەکجار گرنگو ئاڵۆزو دژوارەو ئینسان زۆر وریاوبێدار نەبێ گیرۆدەی سەدو یەك گیروگرفتو کۆسپو هەڵدێر دەبێت .

هەڵبەتە من لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە بڵێم: ئینسان بەزەحمەت دەتوانێ خۆی چاکبکات‌وخواپەرستی بکات، چونکە ئینسان بەسرووشتی خۆی خواناس‌و خواپەرستەو، وەك لەخاڵی پێشوودا لەو فەرموودەیەی پێغەمبەرەوە ﷺ دەرکەوت کەخستمانە ڕوو: مرۆڤ بەئەسڵو

---

(٤٦) رواه البخاري ومسلم.

سرووشت چاكو پاكو خواناسە . بەڵكو ئەوەی من لێرەدا مەبەستمە ئەوەیە كەئەگەر یەكێك بیەوێ زۆر بەمەسەلەی خۆچاككردنو خواناسیندا بچێتە خوارێو ، بەچاكیو خواناسینێكی ئاسایییو هاكەزاییو عەوامانە قایل نەبێو بەكەمی قەناعەت نەكاتو بەرەو چاكترو بەرزتر بڕوات ، ئەوە دەبێ زۆر وریاو بێدار بێو ، مەگەر بەدەگمەن دەنا مەبەستی ناوبراو بەبێ مامۆستاو چاوساغێكی ڕاستو تەواو مەیسور نابێت ، ئنجا بڕیەش دەڵێم دەبێ زۆر وریابێ چونكە ئەو بەرەو لوتكەو دوندە بەرزەكانی عیرفانو خواناسی دەچێو ، دیارە ئینسانیش هەتابەرزتر بێتەوە ، هەم مەترسی كەوتنەخوارەوەی پتر لێدەكرێو ، هەم ئەگەر بكەوێتە خواریش زیانی زیاتر دەبێت .

هەربۆیەش ئەهلی عیرفانو تەصەووفی ڕەسەن ئایەتی: ﴿ یاءَیُّها الَّذینَ آمَنوا اتَّقوا اللّهَ وَكُونُوا مَعَ الصّادِقین ﴾ التوبة ( ١١٩ ) یان كردۆتە دروشمی ڕێبوارانی ڕێی بەرەو خواچوون ! !

بەڵێ . . . هەر بەوەندە كارت پێكنایەت كەپارێزلەخوا بكەی ، بەڵكو دەبێ لەگەڵ ( ڕاستان ) یش دابی !

هەروەك چۆن قوتابییەك كەدەیەوێ فێری زانیاری پزیشكی ( علم الطب ) بێت ، هەر بەوەندە بەمراد ناگات كەكتێبو بەرهەمی ئەو زانایانە بخوێنێتەوە كەلەو دەریاوە شارەزا بوو ون ، بەڵكو پێویستە لەسەر دەستی شارەزاو چاوساغانی ئەو زانیارییە تێبگاتو پێبگات .

كەواتە : ئەو قسەیەی كەئیمامی غەزالیو زۆری دیكەش لەزاناو دڵبێدارانی عیرفانو تەصەووف لەپێشینانی ئەو ڕێبازەیان گێڕاوەتەوە كەدەڵێ: ﴿ مَن لَم یَكُن لَهُ شَیخٌ فَشَیخُهُ الشَّیطانُ ﴾ ، ئەگەر وشەی ( شێخ ) بەمامۆستاو چاوساغو ڕێنیشاندەر لێك بدەینەوە ، دەزانین كەقسەی ناوبراو هەتا ڕادەیەكی زۆر ڕاستی پێكاوە ! !

هەڵبەتە وشەی ( شێخ ) یش كاتی خۆی هەر بەو مەعناو مەبەستە بەكار هێنراوەو بەكەسێك گوتراوە ( شێخ ) كەبەزمانی حاڵو وتار لەسەر بنچینەی قورئانو سوننەتو لەبەر تیشكی شەرحو تەفسیری پێشینان ( سلف ) ی صاڵحدا لەهەموو بوارو لایەنەكانی ژیاندا خەڵكی تێدەگەیاندو پێدەگەیاندو چاكدەكردو بەرەو خوا دەبرد ، بەڵام دوای لاڕێبوونو لەئیسلام دووركەوتنەوەو ڕێلێتێكچوون ، وشەی ناوبراویش وەك دەیان وشەو زاراوەی دیكەی ڕەسەنی ئیسلام دووچاری گۆڕانو شێوێنران بوو .

## ٧- بێئاگایی ( الغفلة ) :

لەبیرچوونەوەو بێئاگایی یەكی دیكەیە لەكۆسپو بەربەستەكانی سەر ڕێگای صاڵحبوونو بەرەو خواچوون ، چونكە هەروەك چۆن دزوجەردە لەكاتی خەوتنو بێئاگاییو تاریكی نیوەشەودازەفەر بەباباى خاوەن ماڵو خاوەن دووكان دەبەنو ، گورگیش لەكاتی خافڵاوی شواندا دەرفەت وەردەگرێ ، شەیتانی بەدیش بەهەمان شێوە لەكاتی بێئاگایی ئینساندا خەریكی كاری

خۆی دەبێت، ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی دیکەشەوە مرۆڤ بەهۆی بێئاگاییو خافڵانەوە ئەگەر گریمان شەیتانیش دنەی نەداتو تووشی خراپەی نەکات، بێئاگاییو خافڵان هەر خۆی لەخۆیدا تەمەن بەزایەچوونو کات لەدەستچوونەو، دیارە تاقە سەرمایەی دەستی ئینسانیش لەژیانیدا تەمەنیەتیو، ئەگەر ئەمیشی بەبێ هۆو سوود بەفیڕۆدا مانای وایە خۆی دۆڕاندووە ! !

دەربارەی مەترسیو زیانی لەبیرچوونەوەو بێئاگاییش لەژیانی ئینساندا دەقی قورئانو سوننەت زۆرن، بۆنموونە هەندێکیان دەخەینە ڕوو :

- ﴿ وَلَقَد عَهِدنا إلى آدَمَ مِن قَبلُ فَنَسِيَ وَلَم نَجِد لَهُ عَزمًا ﴾ طه ( ١١٥ )
- ﴿ وَلاتَكُونوا كَالذينَ نَسوا اللهَ فَأنساهُم أنفُسَهُم . . . ﴾ الحشر ( ١٩ )
- ﴿ الشَيطانُ جاثِمٌ على قَلبِ ابنِ آدَمَ فَإذا ذَكَرَ اللهَ تَعالى خَنَسَ وَإذا غَفَلَ وَسوَسَ ﴾ (٤٧) .

کەواتە خوێنەری خۆشەویست !

ئەگەر دەتەوێ شەیتانی بەد وەك گورگی هار زەفەر بەمێگەلی سەعاتودەقەکانی تەمەنت نەباتو، وەك دزی ماڵبڕ ڕێ بەخانووی دڵت نەبات، هەوڵدە هەمیشە بەهۆی یادی خواوە ئاگادارو وریاو دڵبێدار بیو، وەك شوانێکی وریاو ئازاو بەمشوور زۆر بەوردی بەسەر ڕانەمەڕی کاتەکانی تەمەنت ڕابگەو چاودێرییان بکە، کەبێهوودە لەدەست نەچن، وەبەهۆی یادی خواوە باهەمیشە ماڵی دڵت ڕووناکو درەوشاوە بیو جێگەی شەمشەمەکوێرەی خوتخوتەو داڵغەی شەیتانو نەفسی بەدی تێدانەبێتەوە .

## ٨- شەیتان :

لەڕاستیدا شەیتان لەعنەتی خوای لێبێ سەختترینو بێرەزاترین کۆسپو لەمپەری سەر ڕێگای صاڵحبوونو بەرەو خواچوونەو، خوای بەرزو مەزنمان جل جلاله لەچەندەها ئایەتدا ئاماژەی بۆومەسەلەیە کردووە، بۆوێنە : ﴿ إنَّ الشَيطانَ لَكُم عَدُوٌّ فَاتَّخِذوهُ عَدُوًّا . . . ﴾ فاطر ( ٦ ) .

بەڵام ئێمە بۆیە خستمانە دوای هەموو کۆسپو بەربەسەکانی دیکەی سەر ڕێگای ناوبراو، چونکە شەیتانی بەد هەر بەهۆی ئەو حەوت تەڵەو داوانەی پێشەوەیە کەدەتوانێ زەفەر بەئینسان بەرێ !

بەڵێ شەیتانی نەگریسو پیس لەعنەتی خوای لێبێ، بەهۆی : خراپ ل ئیسلام

---

( ٤٧ ) رواه البخاري.

حاڵیبوونو ، گوناحە ڕواڵەتیو (٤٨) پەنهانەکانو ، خۆشەویستی دنیاو (٤٩) ، شوێنکەوتنو لاساکردنەوەی کوێرانەی پێشینانو دەوروبەری خوارو هەڵەو ، بێ‌ماموستاییو چاوساغیو ، بێ‌ئاگاییو لەبیرچوونەوە دەرفەت لەڕێبوارانی ڕێی بەرەو خواچوون دەبینێو ئامانجو مەبەستی گلاوی خۆیان. کەبریتییە لەلەخوا دوورخستنەوە ، یان لانی‌کەم مەحتەلکردن لێوەدەست دێنێ .

• • •

جامسوڵمانی بەڕێزو خۆشەویست !

ئەمانە بەکورتی هەشت کۆسپو چەپەرو بەربەستە هەرە سەختو بێزەزایەکانی سەر ڕێگای صاڵحبوونو بەرەو خواچوونن ، خوا یاربێ زۆرت ئاگا لەخۆ بێو چاکیان لێ وردبەوەو هێندەی سەری دەرزییەش لێیان مەترسە ، چونکە هیچ شتێك خۆی بۆ پیاوان ( رجال ) ڕانا‌گرێو هیچ کۆسپێك ڕێگا بەمەردی خوا ناگرێ ، دیارە کەسێکیش گوڵی بوێ دەبێ ئازاری دڕكو داڵیش لەخۆی بگرێو عارەبیش زۆر جوانیان گوتووە :

بقدر الكدّ تُكْتَسَب المعالي
من طَلَبَ العُلى سَهَر الليالي (٥٠) .

ئیدی هیوادارم تۆی بەڕێزیش تێکڕای ئەو گرێو گۆڵانەی سەر ڕێت بەبڕوای بەتینو عەزمی پۆڵایینو دڵی پڕ لەئەوینەوە وەك خەنجەری دەبان هەڵبڕیو تێیان نەوەستیو ڕانەوەستی هەتا دەگەیە مەنزڵو بەئاکامو مراد دەگەی .

---

( ٤٨ ) خودای بەرزو مەزنمان فەرموویەتی : «وذروا ظاهر الإثم وباطنه . . . » الأنعام ( ١٢٠ ) ، واتە : وەواز لەگوناحە ئاشکراو پەنهانەکان بێنن .

( ٤٩ ) گوتراوە ( حب الدنيا رأس كل خطيئة ) ، هەڵبەتە ئەم قسەیە زۆر جوانو ڕاستو بەجێیە ، بەڵام سەبارەت بەفەرموودەی پێغەمبەر لەقەڵەمدرانی مشتومڕی لەسەرە . بڕوانە : كشف الخفا ومزيل الإلباس ، ب١ ، ل٤١٢ ، ٤١٣ .

( ٥٠ ) واتە : بەپێی هەوڵو تێکۆشانو ماندووبوونی خۆت پلەو مەنزڵگای بەرزت دەست دەکەوێ ، ئەو کەسەیش یەوێ مەنزڵی بەرزی بێ شەونخوونی زۆر دەبینێ .

## دواقسەم

خوێنەری سەنگینو شیرینو مسوڵمانی خواناسو بەدین !

ئەم نووسراوەی بەردەستت- خوا پشتیوانبێ- تاڕادەیەكی زۆر ناوو نێوەڕۆكی یەكنو، ڕێگای چاكبوونو بەدیداری خواشادبوون، كەئامانجو مەبەستی هەرەبەرزو گرنگی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و زاناو چاوساغانو دۆستانیخوا (أولیاءالله) بووە، ڕوون دەكاتەوە .

مەبەستیشم لە (صاڵحبوون) ئەوەیە كەئینسان بەس بۆخوا بژیو تەنیا بەپێی بەرنامەی ویش بەڕێوە بچێ، لەدەروودەروون (ظاهر وباطن) ی خۆی و، وردو درشتی ژیانو گوزەرانیدا .

وەمەبەستم لە (بەرەو خواچوون) و بەدیداری خوا (لقاءالله) شادبوون، ئەوەیە كەئینسان هێندە بەگەرمیو قووڵی خوا بناسێو، بەدڵو دەروونو هەستونەست هێندەی لێنزیك بێتەوە، كەبگونجێ بچێتە ڕیزی ئەو بەندە ساغو هەڵبژاردانەی خواوە كەشەیتانی بەد بەشەیانیی خۆیەوە یەخەی لەبەر دادڕیونو گوتوویەتی پێیان ناوێرمودەسەڵاتم بەسەردا ناشكێن: ﴿ قالَ رَبِّي بِما أغوَيتَني لأُزَيِّنَنَّ لَهُم في الأرضِ وَلأغوِيَنَّهُم أجمَعينَ إلاّ عِبادَكَ مِنهُمُ المُخلِصينَ ﴾ الحجر (٣٩-٤٠) .

ئیدی هەتا گۆشەیەكی دیكەی بەرنامەی تێرو تەواوی خوای باڵادەستو كاربەجێدا پێك دەگەینەوە، بەخوات دەسپێرم .

والسلام علینا
وعلى عباد الله الصالحین

خدراوا (١٩٩٠)

• • •

# كاكڵی باسەكان

## لەم نامیلکەیەدا

هەوڵ دراوە بەشێوەیەکی کورتو گوشراوو سادەو ڕەوان ڕێگای صاڵحبوونی
ئینسانی مسوڵمانو بەرەو خواچوونی بخرێتە ڕوو، بەهیوای ئەوەی کەبتوانین هەرچی زیاتر
خۆمان چاك بکەین تا سەرەنجام لەپیتو بەرەکەتی ئەو خۆگۆڕینو چاکبوونەدا، شیاوی
ئەوە بین کەخوای میهرەبان ودادگەر واقیعی تێکچوو و شێوێنراوی گەلە چەوساوەکەشمانمان
پێ بگۆڕێو، بمانکاتە میراتگرانی زەوی خۆیو بەڕێوەبەرانی ئایینو بەرنامەکەیو
ڕزگارکەرو مشوورخۆری بەشێك لەئوممەتی پێغەمبەری هەڵبژاردەی
صلی اللە علیەوسلم

ژمارەی سپاردنی بە کتێبخانەی نیشتیمانیی هەرێمی کوردستان (٩٧) ساڵی (١٩٩٦)

چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان